بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ناسنامەی کتێب

**ناوی پەرتووک: تێکۆشانی ئێستا و بەرهەمی ڕۆژی دوایی**

**نووسینی: عبدالله خاکی**

**نـەخـشەسازیی بەرگ: محمد سیانی**

**نەخـشەسازیی ناوەوە: نووسەر**

**نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم، ١٤٤٤ کۆچی – ٢٠٢٢ میلادی**

**لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە «»ی ساڵی «٢٠٢١»ی پێ دراوە.**

# پێشكەشە

- بە دایك و باوكی ئەزیزم كە بوونە چراو ڕووناكی ژیانم.
- بەو موسڵمانەی كاتێك بالغ دەبێ و خۆی دەناسێ لەو ساتەوە تێكۆشان بۆ الله دەكاتە ئامانجی ژیانی.
- بەو موسڵمانەی لێدانی ترپەی دڵی و گشت جولانەوەیەكی بۆ جگە اللەی خاوەن عەرش حەرام دەكات بۆ گشت كەسێ.
- بەو موسڵمانەی سەختی و ناخۆشی قەبر و ئاگری دۆزەخ خۆشی و ڕابواردنی دونیای لا تاڵ كردووە.
- بەو موسڵمانەی خۆشی و ڕابواردنە كاتییەكانی دونیا دەكاتە قوربانی ساتێكی كەمی بەهەشت و مەردانە بۆی تێدەكۆشێت.
- بە سەرجەم ڕۆلە و نەوەكانی ئەم ئیسلامە لە هەر كوێیەك بن.
- بەوانەی بۆ جارێكیش بێ ناویان لە نزا و دوعاكانیان هێناوم.

خاكی

# پێشەکی نووسەر

الْحَمْدُللهِ شَرَحَ صُدُورَ الْمُؤْمِنِينَ فَانْقَادُوا لِطَاعَتِهِ، وَحَبَّبَ إِلَيْهِمُ الْإِيمَانَ وَزَيَّنَهُ فِي قُلُوبِهِمْ، فَلَمْ يَجِدُوا حَرَجًا فِي الاِحْتِكَامِ إِلَى شَرِيعَتِهِ، وَأَشْهَدُ أَنْ لَاإِلَهَ إِلَّااللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحَابِهِ، وَسَلَّمَ تَسْلِيمًا كَثِيرًا إِلَى يَوْمِ الدِّينِ.

ژیانی دونیا گەشتێکی کاتیە و مانەوە تێیدا بۆ مرۆڤ تا سەر نیە، بەڵکو ڕۆژێکمان لە پێشە بۆ کۆچکردن تێیدا و ئەبێ هەرچی گیان لەبەرە تام و شەرابی مردن بنۆشێ و ئەم ژیانەی دونیا بۆ یەکجاری بەجێ بێلیت، بەڵام مرۆڤ بەداخەوە بە جۆرێک گیرۆدە و وابەستەی ژیانی ئەم دونیاییە بووە، کە ماڵ و موڵکی هەمیشەیی بێت و بێئەوەی تێ بفکرێ و بیر لە خۆی بکاتەوە دروست بوون و هاتنە ژیانی دونیای بۆ ئەوەیە تاقیبکرێتەوە.

بۆیە ژیانێک کە کاتی و کەم و مانەوەی هەمیشەیی نەبێ و بەردەوام مردن لە چاوەڕوانیت بێ و نەزانی کات و ساتێکی تر چ ڕووداو و کێشەیەك بەرۆکت ئەگرێت، ئەبێت بزانیت کە هیچ تام و چێژێکی وای نیە دڵت پێ خۆشبێت، چونکە هەمیشە نامورتاح و بێتاقەتی و کاتێك ئەزیزێکت لە ژیان ماڵئاوای دەکات و بۆ یەکجاری لەبەر چاوان وون دەبێت.

ئەوکاتە ژیان لە پێش چاوت ئەبێتە پارچەیەک لە ئاگر و گەرمی و ناخۆشییەکانی وێران ئەکات، هەست و ناخۆشیەک ڕوو دەکاتە ناخت، بەتەواوی خۆشیەکانت لە پێش چاو ڕەش ئەکات.

بۆیە لەم نامیلکەی بەردەستان وویستومانە موسڵمان لە ژیانی دونیا و لەو تەمەنە کەمەی کە هەیەتی بە فرسەتی بزانێت، ئەو ماوە کورتەی بەشی هەر یەکێکمانە شایەنی ئەوە نیە خۆشی و نازو نیعمەتی هەمیشەی بەهەشتی لەسەر بدۆڕێنین، بەڵێ هەوڵمانداوە هانیان بدەین بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی الله و کۆکردنەوەی چاکە و زەخیرە دانان بۆ ڕۆژی دوایی.

چونکە ئەم ژیانەی کە تێیداینە، تەنها تاقیکردنەوە و هەڵسەنگاندنە لە لایەن اللەی خاوەن عەرش بۆ ئێمەی مرۆڤ و بەتایبەت موسڵمان، کە چۆن و چی بکەین، بەچ شێوازێک کاتەکانی ژیانمان بەڕێ بکەین، لەم چەن ئامۆژگارییەی بەردەستتان تەواوی گومان و پرسیار گەلێکی ئەو کەسانە وەڵام ئەداتەوە، کە بێخەم پشتیان کردووە لە بەرنامەی الله و دونیا و خۆشیەکانی پەردەیی غەفلەت و بێئاگایی دڵ و چاویانی داپۆشیوە، بۆیە کەوتوونەتە دوای حەزو ئارەزووی نەفس و پشتیان لە دواڕۆژ و قیامەت کردووە

بە ویستی الله ئەم نووسینە ووشیارکەرەوەیەکی بەسوودە کە ئامانج لێی سەرفرازی و بەختەوەری تۆیە بۆ دونیا و دواڕۆژت.

هیوادارم بە ووردی و تێگەیشتنەوە بیخوێننەوە و سوود و پەندی لێوەر بگرین و ببێتە هۆی بەرچاو ڕوونیمان بۆ ناسینی حەق و بڵاوکردنەوەی ئەو حەقە لە نێو تاك و تەواوی کۆمەڵگا و بەردەوام بوونمان لەم ڕێگاییە تاکو سەرنجام بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەت دەبێتە شوێنی مانەوەی هەمیشەیمان بە ئیزنی الله تعالی.

داواکارم لە اللەی خاوەن عەرش ئەم ماندووبوونەی چێشتوومانە لە نووسینی ئەم کتێبە و تەواوی کردەوەکانمان لێ قەبووڵ بکات، کە تەنیا بۆ ڕەزامەندیی خۆی بێت، هیچ ماندووبوون و کارێکمان بۆ جگە لەو نەبێت، و بەردەوامیمان پێ ببەخشێ لەسەر رێبازی پیرۆزی تەوحید.

**اللَّهُمْ اجْعَلْ عَمَلِي كُلَّهُ صَالِحَاً وَاجْعَلْهُ لِوَجْهِك خَالِصَاً وَلا تَجْعَلْ لِأَحَدٍ فِيهِ شَيْئَاً**

عبدالله خاکی.

٢٠٢٢/١١/١٣ یەك شەم



## بەهەشت و دۆزەخ لە پاداشتی چین؟

دەبێ ئێمەی موسڵمان زۆر جیاواز بین لە کەسی جاهیل و نەزان و دوور لە ئیسلامدا و بزانین چۆن ڕەزامەندی الله تعالی بەدەست بێنین و بەرەو بەهەشت بڕۆین، چونکە بەهەشت بەئاسانی بەدەست نایێ بە دوورکات نوێژ و ڕۆژوو تەواو دەچمە بەهە شت، نەخێر بەڵکو تێکۆ شان و شەونخونی و ماندووبوونی دەوێت ئەزیەت و ئازاری دەوێ تاعەت و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی الله عزوجل پاشان پێغەمبەری پێشەوای دەوێت ﴿ﷺ﴾ **(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ قَالَ (حُجِبَتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ، وَحُجِبَتِ الجَنَّةُ بِالْمَكَارِهِ)**[1] واتە: لە ئەبو هوڕیرەوە (ڕەزای اللەی لێ بێت) لە پێغەمبەری ئازیزەوە ﴿ﷺ﴾ فەرمووی یەتی: دۆزەخ دەورە دراوە بەئارەزوو و هەوەسبازی, وە بەهەشت دەورەدراوە بە ناخۆشی و ناڕەحەتی.

بەڵێ برا و خو شکە سەنگینەکانم ئێمە نابێ وابیر بکەینەوە کە بەهە شت بە ئا سانی بەدە ست دێ و ئەوەی تاوان و سەرپێچییە ئەنجامی بدەین و خۆمان ماندو نەکەین بۆ تاقیکردنەوەی دونیا و پاڵبدەینەوە بێخەم.

---

[1]- بڕوانە: البخاري (٦٤٨٧)، ومسلم (٢٨٢٣)

نەخێر لە ژیانی دونیا هەر وەکو چۆن دەتەوێ پلەو پایە بەدە ست بێنی هەوڵ و کۆششی بۆ ئەکەی بۆ نموونە: تۆ قوتابی لە قوتابخانە دەبێ خۆت ماندو بکەی بۆئەوەی سەرکەوتووبیت بۆ ئاوات و ئامانجەکەت، لە هەر قوتابییەك بپرسی بۆچی دەخوێنی؟ لە وەڵامدا دەڵێت: بۆ دکتۆر، ئەندازیاری، مامۆستای فلان و فلان.. هتد

بۆیە ئەگەر خۆیان ماندو نەکەن، ئەو ئاواتەیان بەدێ ناهێت و ئەبێتە تۆزی بەر با، ئەبێت واجبەکانی بە با شی جێبەجێ بکات کە مامۆ ستا واجبی پێداوە، و قوتابیەکی چالاك و پاك و خاوێن و ئاقڵ و ژیر بێت لە فەرمانی مامۆستاکەی دەر نەچێ بۆ ئەوەی لە بری ماندوی و زیرەکی و ئاقڵی ..هتد نمرەیەکی بەرزی پێبدات و ئاواتەکەی بەدێ بێت و دوا ڕۆژێکی گەشی هەبێت!

بە پێچەوانە ئەگەر قوتابیەکی تەمبەل و گوێدار نەبوو، واجبەکانی جێبەجێ نەکرد، پاك و خاوێن نەبوو، بێگومان مامۆستا هیچ نمرەیەکی وای پێنادات دڵی پێخۆشبێت و سەرکەوتوو بێت و پاشەڕۆژێکی پرشنگداری هەبێ و بە ئاواتی بگات!.

بۆیە ئەی براکەم خوشکی من ڕەحمەتت لێ بێت تێکۆشان لە دونیا بۆ بەدەستهێنانی بەهەشت هەروەك ئەم نموونەیە، ئەگەر تۆش هەوڵ و تێکۆشان نەکەی بە پیشە و خەمت بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی الله تعالی پاشان چوونە بەهەشت نەبێ، بێگومان وەك قوتابییە بێخەمەکە سەرکەوتوو نابی و پاشەڕۆژت ئەفەوتێ بێبەش ئەبیت لە چوونە بەهەشت، چونکە ناگونجێ ڕێبازی الله تعالی پشت گوێ بخەی لە پێناو خۆشی نەفست و هەر خەریکی تاوان و سەرپێچی بی لە ژیان،

﴿وَلَاتَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللَّهَ فَأَنْسَاهُمْ أَنْفُسَهُمْ﴾[1]. واتە: نەکەن وەکو ئەو کەسانە بن کە اللەیان فەرامۆشکرد، شوێنی بەرنامەکەی نەکەوتن، اللەش ئەوانی لە بیر خۆیان بردەوە.

ئەبێ هەردەم مەردی مەیدان بین و خۆمان ماندو بکەین و تێبکۆشین وەکو قوتابیە چاڵاك و ژیرەکە، و نەفس و ئارەزووی خراپمان تەسلیم بکەین بە اللە تعالی تاکو ڕێگای چوونە بەهەشتمان بۆ ئاسان بێت.

﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى﴾[2]. واتە: بەڵام ئەوەی لە پایە و شکۆی پەروەردگاری ترسابێت و حیسابی بۆ کردبێت و جڵەوی نەفسی گرتبێتەوە لە هەموو هەواو هەوەس و ئارەزوویەکی نادروست.

بێگومان بۆ ئەو کەسانە لە دونیا خۆشی و خەفەتیان کردبوو بە تێکۆشان بۆ ڕەزامەندی اللە تەنها بەهەشت پاداشتیانە، ﴿فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى﴾[3] واتە: بێگومان هەر بەهەشت جێگەی مانەوەو حەوانەوەو گوزەرانیەتی.
کە وەکو خەڵکی نەبوون زۆر خۆیان ماندوو ئەکرد بە عیبادەت و پەرستنی اللەی خاوەن عەرش، چونکە ئەیزانی لەناو تاقیکردنەوەی ژیانی دونیا دایە و کاروباری دواڕۆژ گاڵتە نییە.

---

[1]- سورەتی الحشر ئایەتی١٩

[2]- سورەتی النازعات ئایەتی ٤٠

[3]- سورەتی النازعات ئایەتی ٤١

ڕەحمەتی الله لە سەلەفی ساڵح بێت بەڕاستی بەندەیەکی دڵسۆز و پاکی الله تعالی بوون، لە حەقیقەتی دونیا و دواڕۆژ تێگەیشتگوون، بۆیە بەم شێوە پشتیان لە دونیا و ڕوویان لە دواڕۆژ کردبوو، بەڕاستی گەر مرۆڤ لە حەقیقەتی ئەم ژیانە حاڵی ببا و بیری لە ناخۆشی و ئەزیەتی دواڕۆژ کردبایەوە، ئەوەندە وابەستەی دونیا و خۆشی و هەڵاو بەزمی نەئەبوو، تۆ بیرت کردۆتەوە ڕۆژێکی گەرم نەخۆشی لە چاوەڕوانی دکتۆر وەستاوی، خەڵکی زۆر لەپێش تۆن، ئەوکات چ هەستێکت دەبێ، بێگومان بێزار و دڵ تەنگ دەبی، لە ناخۆشی و ماندووی ئاوات دەخوازی مردبای، ئەی چاوەڕوانی ڕۆژی مەحشەر و وەستان لەو ڕۆژە، ئەی ژێر گۆڕ دەبێ چۆن بێ!

ئەی هاوار یاالله ئەی قەومەکەم بەئاگاوەرنەوە، بەسە تەسلیمی اللەبن، دڵنیابن بەغەیری تەسلیم بون بۆ الله و ڕێگای ئیسلام ئەوەی تر شەرمەزاری و سەر شۆڕیە، بۆیە بۆ ئەوەی لەناخۆشی دواڕۆژ ڕزگارمان بێ با تا لە دونیاین تەنها بەندەی الله تعالی بین.

عبدالرحمن بن ثروان دەڵێت: الأسود بن يزيد تێ ئەكۆشا بۆ ڕۆژوو گرتن و پەرستش کردن تاوەکو جەستەی سەوز یان زەرد هەڵدەگەڕا، ئینجا علقمە پێی دەگوت: بۆ ئەم جەستەیە ئاوا ماندو ئەشکەنجەی ئەدەی؟!

ئەویش ئەیفەرموو: بەڕاستی کاروباری دواڕۆژ گاڵتە نییە بەڕاستی کاروباری دواڕۆژ گاڵتە نییە.

(عن عبد الرحمن بن ثروان قال: كانَ الأَسْوَدُ بْنُ يَزِيدَ يُجْهِدُ نَفْسَهُ في الصَّوْمِ وَالْعِبَادَةِ حَتَّى يَخْضَرَّ جَسَدُهُ وَيَصْفَرَّ وَكَانَ عَلْقَمَةُ يَقُولُ لَهُ: وَيْحَكَ لِمَ تُعَذِّبُ هَذَا الْجَسَدَ؟ فَيَقُولُ: إِنَّ الأَمْرَ جِدٌّ إِنَّ الأَمْرَ جِدٌّ)[1]

بۆیە با خۆمان ماندو بكەین بۆ جێگاو شوێنێك كە هەمووی خۆشی و نازو نیعمەتە لەبری ماندوبوونی ئەو كاروكردەوانەی لە دونیا كە لە پێناو الله تعالی ئەنجامان ئەدا، بەڵام بۆ كەسانێكی تاوانبار و دوور لە بەرنامەی ئیسلام جێگایان ناو ئاگرە خەجاڵەت ئەبن لە قیامەتدا بە هۆی پشتكردنیان لەفەرمانی الله و خۆ ماندو نەكردنیان كە وا گومانیان ئەبرد بۆ

خۆشی و ڕابواردن هاتوونەتە دونیا، بۆیە پێغەمبەری پێشەوا ﴿ﷺ﴾ ئاگاداری كردوینەتەوە لەو هۆكارەی كە دەبێتە هۆی دوورخستنەومان لە ڕێبازی ئیسلام و بێئاگا بوونمان لە مردن و هەول نەدان بۆ كردنی كاروكردەی چاكە كە ڕووكردنە لەخۆشییەكان، لە كۆكردنەوەی پارە و بەدواكەوتنی مۆدیل و هەلاو بەزمی دونیا.

﴿إِنَّ مِمَّا أَخَافُ عَلَيْكُمْ من بَعْدِي مَا يُفْتَحُ عَلَيْكُمْ مِنْ زَهْرَةِ الدُّنْيَا وَزِينَتِهَا﴾[2] واتە: پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: ئەوەی لەدوای خۆم دەترسم توشتانبێت و ببێتە مایەی دوورخستنەوەتان لە دینەكەتان خۆشی و ڕازاوەیی ئەم دونیاییە كە زۆر كورتەو بەخێراییش دەبڕێتەوە.

---

[1] ـ بڕوانە: كتاب حفظ العمر لابن، - ٤٧ -

[2]- بڕوانە: بوخاری ١٤٦٥

بۆیە ئێستا سەردەمی بە دواکەوتنی دونیا و خۆشیەکانیەتی و بێئاگان کەوا ڕۆژێك دێت مردن ئەیبات بەرەو دونیای تر، بەداخەوە بۆ کەسانێك کە سوویان لەخۆیان نیە ببەنە سووتەمەنی ئاگر و ئەزانن ڕۆژێك دێ ئەمرن و ئەچنە ژێر گۆری تەنگ و تار، بەڵام ئەم کەسانە ڕۆچوونە لە هەواو ئارەزووی دونیا، بۆیە وایان لێهاتووە کە ڕۆژی دواییان بیرچۆتەوە، کەوایە ئەی برای من تاکو مردن بەرۆکی نەگرتووین بیر بکەوە، خوشکی سەنگینم بەو کەسانە هەڵمەخەڵەتێ کەوا بۆ دونیایی کاتی ئەژین وازیان لە هەولدان بۆ بەهەشت هێناوە کە بەنرختر و بەردەوامترە!

﴿وَمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ وَإِنَّ الدَّارَ الْآخِرَةَ لَهِيَ الْحَيَوَانُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾[1] واتە: ئەم ژیانەی دونیا تەنها رابواردنێکی بێهودەو یاری منداڵانە وە هەرچی ژیانی ڕاستەقینەیە و هەمیشەیە ژیانی ئاخیرەتە ئەگەر بزانن!

بیزانە هەر کاتێك باسی دونیا و خۆشیەکانی ئەکرا لەلای پێشەوای تابعین حەسەنی بەسری (رەحمەتی الله تعالی لێ بێت) ئەویش ئەیگوت:

(أحلام نومٍ أو كظلٍّ زائلٍ، إنَّ اللبيبَ بمثلِها لا يُخدَع)[2]

واتە: دونیا و خۆشیەکانی هەروەک خەوێک یان سێبەرێک وایە کە نامێنێت و تیادەچێت، بەڕاستی کەسی ژیر و عاقڵ بە هاوشێوەی ئەوە فریو ناخوات.

بۆیە با ئاخیرەت لە دەست نەدەین هەردەم بیرت با لای مردن بێت و خۆمان ماندوو بکەین بۆ الله چونکە بەڕاستی لە تاقیکردنەوەی سەخت داین بە تێکۆشان و ماندوو بون نەبێت، سەرکەوتن و دەرچوون لێی زۆر سەختە.

---

[1]- سورەتی العنكبوت ئایەتی ٦٤

[2]- الزهد لابن أبي الدنيا: ٢٣

بۆیه ئەی برا و وخوشكانم با بە ئاگا بێینەوە بۆ ئەوەی لە كەسانێك نەبین تەنها ئەهلی خۆشی و ڕابواردنی دونیایی كاتین.

﴿يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ﴾[1] واته: تەنها شارەزای ژیانی ڕووكەشی دونیان بەڵام بێئاگان لە رۆژی دوایی.

با توێشوو بۆ قیامەت بەڕێ بكەین تاكو بەهەشت بەدەست بێنین، خۆشی دونیا وای كردووە كە مرۆڤ هەموو كارێكی تەنها بۆ دونیا بێ هەر وا گومان دەبەن ژیان بەسەر بردن لە دونیا بۆ یەكجاری و هەمیشەییە بۆ ڕابواردن و تێركردنی نەفسیان هاتوونەتە دونیا و بە گومانی خۆیان وەكو چۆن خانوو، سەیارە، یان موڵكێك تاپۆ دەكەن لەسەر خۆیان كە بۆ هەمیشە دەبێت خاوەنی، بە هەمان شێوە وا دەزانن دونیاش ماڵی هەمیشەیی خۆیانە و تاپۆیە!
بێئاگا لەوەی الله تعالی ئاگاداری كردوینەتەوە كە مانەوەمان بۆ هەتا هەتای نیە و ڕۆژێك بەناچاری ماوەی ژیانمان كۆتای پێدێت.
﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ﴾[2] واته: ئایا گومانتان وادەبرد كە بە ڕاستی ئێمە ئێوەمان بە بێ مەبەست دروست كردووە و ئێوە بۆ لای ئێمە ناهێنرێنەوە؟!

---

[1]- سورەتی الروم ئایەتی ٧

[2]- سورەتی الؤمینون ئایەتی: ١١٥

جا ئەوەی گرنگە لەم ژیانە کۆکردنەوەی تێشــووە بۆ ڕۆژی دوایی، تۆ ڕێبواری دەتەوێ بڕۆی بۆ شــارێکی دوور ئەگەر هاتوو شــتی پێویســتت نەبرد لەگەل خۆت بۆ ئەم ســەفەرە ئاو، خواردن و شــتی پێویســت ..هتد بێگومان لە ڕێگادا ماندو و هیلاك دەبی و تێدەچی بەهۆی دووری ڕێگاکە و برسیەتی و تێنوییەتی، توشی ناخۆشی و نارحەتی و ماندوو بوون دەبی و دەمریت.

ئینجا برا و خوشــکانی بەڕێزم تۆش لە دونیا هەر وەک ئەم ڕێبوارەی کە ســـەفەرێکت لە پێشـــە دەبێ بێگومان کۆچی بۆ بکەی کە قیامەتی نەبڕاوەیە، باشترین خۆراک و خواردنەوە بۆ ئەم سەفەرە تەوحید و کۆکردنەوەی توێشووە کە بریتیە لە ترسان لە الله تعالی و چاکەکردن و پابەند بوون بە ئیسلامەوە.

﴿وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَىٰ وَاتَّقُونِ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ﴾[1] واتە: بەردەوام هەوڵ بدەن کە زەخیرەو توێشوو هەڵبگرن بێگومان چاکترین زەخیرەش تەقواو پارێزکاریە، بەردەوامیش لە من بترسن ئەی خاوەن بیرو هۆشەکان.

نرخ و ڕێزی ژیانی کاتی دونیا کەس نازانێت جگە کەســانێکی لە الله ترس چونکە باش لە مەبەســت و مەرامی دونیا تێگەیشــتوە کە کاتین و خزم و ناســیاوەکانی مردن و شــارەزایە بە زانســتی شــەرعی بەم هۆیەوە بۆی دەر دەکەوێت کە دونیا تەنها ڕابواردنێکی کەمە هەر وەك خەوێکە کە هەستاوە ئیتر ڕۆژی قیامەتە.

پاشان دەتوانن بۆ زیاتر تێگەیشتن و زانینی نرخی دونیا پرسیار لە مامە حاجی یەکی پیر کە ســەر و ڕیشــی ســپی بووە، کە کاتی خۆی گەنجی مەیدان بوو لە جوانی ناوبانگ دەولەمەندی ماڵ و منداڵ لە هیچ ناز و نیعمەتێکی کەم نەبوو،

[1]- سورەتی البقرة ئایەتی: ١٩٧

بەڵام دونیا ڕۆژ بەڕۆژ ڕۆژگاری بەجێ دەهیشــت بەڵام مامە حاجی بێئاگا بوو، هەر بەخۆشـــی و جوانی و ناو بانگی نازو فیزی دەکرد وازی هێنا بوو لە فەرمانەکانی الله تعالی و بێئاگا بوو لەوەی دونیا شـــوێنی تاقیکردنەوەیە، جا تاوەکو گەیشـــتە ئەم ڕۆژگارەی پیری و پەکەوتەی، بۆیە هەرکەس ویســـتی خۆشییەکانی دونیایی بۆ ڕوون بێتەوە بابچێتە لای ئەم مامە حاجیە کەمێ باسی حالی خۆی بۆ بکات کەچەن خۆشی بینیوە لە وەڵامی مامە حاجی بۆت، کوڕی خۆم: نازانم چۆن وەڵامت بدەمەوە من وا ئێ ستا تەمەنم بۆ هە شتاکان دەڕوات بەڵام ئەو تەمەنەی بەڕێم کرد لە خۆشی و ڕابواردن هیچی وا نەبوو کە تامی لێ بکەی، خۆشی و گەڕان و سووڕانی زۆرم بینی لە دونیا بەڵام گشتی وەکو چاو تروکانێك بوو تێبەڕی و هەموو ڕۆیشت!

ئینجا لە ســـەرەتاکانی ژیانم لەگەڵ دایك و باوکم دەژیام و وامدەزانی ناتوانم لێیان دووربکەومەوەو بەبێ ئەوان بژیم! (کەچی هەردووکیان مردن)!

ئیتر لەگەڵ خوشـــکو براکـانم دەژیـام و وامـدەزانی نـاتوانم لەوانیش دووربکەومەوەو بەبێ ئەوان بژیم! کەچی هەرهەموویان، کوڕەکان ژنیان هێناو کچەکانیان مێردیان کردو هەر کەســـەو لەگەڵ ماڵ و خێزانی خۆی خەریکی ژیانی خۆیبوو!

منیش بە هەمان شـــێوەی خوشـــکوبراکانم خێزانم پێکهێناو الله تعالی چەند کچێکی پێ بەخشیم، وامدەزانی هەتا سەر هەر لەگەڵ خۆم دەبن! کەچی هەر هەموویان شوویانکرد و چوونە ڕێی خۆیان.

ئیتر تێگەیشتم تەنها الله تعالی لەگەڵ ئینسانەکان دەمێنێتەوە!

لەبەرئەوە لەکۆتایی هەر هەموو پەیوەندیەکانت دەپچڕێن و تاقە پەیوەندیەك کە بمێنێتەوە لەگەڵ الله تعالی یە!

ئەم کاتەی ئێستاش وا تێدام ناوە ستێ دەڕوات بۆیە ئەی کوری شرینم وریابە ژیانی دونیا هەلتنەخەڵەتێنت، ئەی کوڕە ژیرەکەم بزانە ئەوەی ئەو پاداشـــتەی لای الله تعالی لە دوارۆژ لە بری ماندوبوون و تێکۆشـــان لە تاقیکردنەوەی دونیا با شتر و نەبڕاوەترە لەم ژیانەی کەم و کاتییە، ئەوەی دێتە ناو دە ستت لە ماڵ، پارە، ژن و منداڵ، ناوبانگ، دەســەڵات و ســوڵتە، هێز و جوانی ..هتد هەمووی کاتین و تێدەپەڕێت.

﴿فَمَا أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾[1] واتە: ئینجا هەر شـــتێك بە ئێوە بـەخشـــراوە، لەزەت و بەهرەی ژ یانی ئەم دونیایە، زۆر بەزوویی ئەڕوات و نامێنێتەوە.

بەڵێ ئەی کوڕە نازادارەکەم ئاگاداربە ئەو تەمەنە ناســکەت لە ژیانی دونیا بۆ ڕەزامەندی اللەی خاوەن عەرش نەبێ مردن و نەبوونت باشـــترە، بۆیە گشـــت تر پە و ختوکە کانی دڵت کە لێدەدا با نیە تت ئەوە بێ بۆ الله بێت دڵنیابە بەختەوەر و ســەرفراز دەبی و لە دوارۆژیش بە باشـــترین شـێوە پاداشـــتت دەداتەوە،

﴿وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾[2] واتە: ئەو پاداشـــت و بەخشـــشـــەش لای اللە یە بۆ ئەوانەی باوەڕ یان هێناوە، وە بە پەروەردگاریان پشت ئەستوورن، باشتروو پایەدارترە.

---

[1]- سورەتی الشوری ئایەتی: ٣٦

[2]- سورەتی الشوری ئایەتی: ٣٦

بەڵێ براو خوشـــکی من باش بزانن ئەم ژیانەی دونیا لەچاو قیامەت هیچ نیە هەر بۆیە ئەو کە سانەی پشتیان لەبەرنامەی ئیسلام کردبوو، ڕۆچووبوون لە و هەواو هەوســـیان، هەموو ئامانجیان ڕابواردنی ژیانی دونیا بوو، لە قیامەت سوێند دەخۆن کە لە ژیانی دونیا هیچ نەژیاون تەنها چەن ساتێکی کەم نەبێت. ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ السَّـــاعَةُ يُقْسِـــمُ الْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا غَيْرَ سَـــاعَةٍ كَذَٰلِكَ كَانُوا يُؤْفَكُونَ﴾[1]واتە: ئەو ڕۆژەی کە قیامەت بەرپا دەبێت تاوانباران سوێند دەخۆن کە: بەدەر لە ســـاتێك نەماونەتەوە لە دونیادا هەر ئاواش بوو لە دونیادا لا دەدران لە هەق، بۆ ناهەق و بەتاڵ.

کەچی لە دونیا حەفتا، هە شتا، ساڵ ژیاون سوێند دەخۆن هیچ نەژیاون تەنها چەند کات و ســاتێکی کەم نەبێت، بەلام موســڵمانی ڕاســتگۆ و شــوێنکەوتەی پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ دەزانێ ئەم ژیانەی دونیا تاقیکردنەوەیە و ڕۆژێک دێت دەگەڕێنەوە بارە گای الله تعالی بۆ لێ پرســـینەوە لەو کارو کردەوەی کە کردوویانە. ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْـــأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ﴾[2]واتە: ســـوێند بەپەروەردگارت ئەی موحەممەد! ﴿ﷺ﴾ لە هەمووان دەپرسین.

بەڵێ بۆیە خەمی خۆشـــی و ڕابواردنی دونیـای نەبوو وەک ئەوانەی تر کە قیامەتیان بەدوور دەزانی و بێئاگا بوون لە تاقیکرد نەوەی دونیا، دە یانزانی پرســـیار لە هەموو ئەو کار و کردەوەی دەکرێ لە ڕۆژی لەدا یک بوونی تا دواساتی تەمەنی. ﴿عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[3]واتە: لەو کاروکردەوەیە دەیانکرد.

---

[1]- سورەتی الروم ئایەتی:٥٥

[2]- سورەتی الحجرات ئایەتی: ٩٢

[3]- سورەتی الحجرات ئایەتی: ٩٣

هاوەڵانی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) لە سەرە مەرگیشدا ئامۆژگاری کار بوونە بۆ دوای خۆیان کە هەرگیز بە دونیا و خۆشـــیەکانی هەڵنەخەڵەتێین، ئەوەتا هاوەڵی خۆشـەویسـت خاڵی ئیماندااران موعاویەی کوڕی ئەبو سـوفیان (الله تعالی لە خۆی و باوکی ڕازی بێت) کاتێک گەیشتە سەرەمەرگ، هەموو کەسەکانی کۆکردەوە و پێیانی فەرموو: ئایا ئێوە خزم و کەسی من نین؟!
گوتیان بەڵێ خوا بمانکاتە فیدات.
فەرمووی: ئەوە ڕووح و گیانی من وا لە قاچەکانمەوە دەردەچێتە دەرێ، دەی مەهێڵن دەرچێ و بیگەڕێننەوە (واتە ڕێگا مەدەن بمرم)
هەموویان دەســـتیان کردە گریان و گوتیان هێز و توانای ئەوەمان نیە، ئینجا بەدەنگێکی گریاناوی بەرز فەرمووی: لەدوای من بە دونیا هەڵنەخەڵەتێن! [1]
کەوایە ڕەحمەتتان لێ بێت با لەو ساتەوە بەڵێن بە الله تعالی بدەین کە ڕێگای تەوحید ئامانجی ســـەرەکی ژیانمان بێت و دڵەکانمان پاك بکەینەوە لە ژەنگی تاوان کە بۆتە هۆی بەربەست لە دابڕانمان لە کاروانی چاکەکاران.
با بەندەی الله بین ئەو تەمەنەی بەڕێمان کردوە لەبێ فەرمانی و تاوان با لە ئێســـتاوە کە نازانین چەن ســـاتێکی کەم تەمەنمان ماوە و مردن نەبۆتە میوان قەرەبووی بکەینەوە بە الله پەرستی چونکە ژیان بەسەربردن یەکجارە جارێکی تر ناتوانی بگەڕێیەوە بۆ دونیا بۆیە ئەم یەکجارە با بکەین بە قور بانی و ســـوتەمەنی ڕێگای الله تعالی، تا پێمان ببەخشـــێ خەلاتە نەبڕاوەکەی کە بەهەشتی پڕ ناز و نیعمەتە.

---

[1] - سير أعلام النبلاء

## بەهەشت تێکۆشان و ماندوبوونی دەوێ

برا و خوشکانی من ڕەحمەتتان لێ بێت بیزانە هەموو کار و تاقیکردنەوەیەک پێویستی بە کۆشش و ماندوبوون و هەوڵدانە بۆ بەدەست هێنانی پلە و ئامانجێکی دیاری کراو و دەرچوون تیایدا، ئینجا لەبەر ئەوەی ژیانی دونیاش تاقیکردنەوەیە، بۆیە دەبێ ئاگاداری ئەم تاقیکردنەوەیە بین چونکە یەکجارە و دەوری دووەمی نیە، کە مردین دووبارە گەڕانەوەمان بۆ نیە، چونکە دونیا ژیانێکی کەم و کورتە، الله تعالى بۆ ئەوە دروستیکردووە تاکو مرۆڤەکان تاقی بکاتەوە کە کێ گوێڕایەڵی دەکات و خۆی ماندوو دەکات و کێ بێفەرمانی دەکات خۆی لێ بێئاگا دەکات.

﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾[1] واتە: ئەو زاتەی کە مردن و ژیانی داهێناوە تا تاقیتان بکاتەوە کە کردەوەی کامتان چاکترە.

کەواتە ژیانی دونیاش وەکو تاقیکردنەوەی قوتابی لە قوتابخانە پێویستی بە خۆ ماندوو کردن و زەخیرە دانان هەیە.

بۆیە ئەگەر سەیر بکەین الله تعالى لە قورئاندا لە زۆر جێگە پێمان ڕادەگەیەنێ و بیرمان دەخاتەوە کە خۆمان بۆ ئەو تاقیکردنەوەیە ئامادە بکەین و توویێشووی بۆ دابنێین و بازووی کارکردنی بۆ لێ هەڵبکەین پێش ئەوەی پەشیمان بینەوە لە

[1] - سورەتی الملك ئایەتی:٢

دواڕۆژ و ماوەی کاتی تاقیکردنەوەی دونیامان تەواو ببێ و لە دەستمان بچێت و حەسرەت و داخی بۆ بخۆین.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ * وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللَّهَ فَأَنسَاهُمْ أَنفُسَهُمْ أُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ * لَا يَسْتَوِي أَصْحَابُ النَّارِ وَأَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمُ الْفَائِزُونَ﴾[1] واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە لە الله تعالى بترسن، وە هەرکەسێ با سەرنج بدا داخوا چی بۆ بەیانی (ڕۆژی قیامەت) پێش خسووە، وە لە الله بترسن، بەڕاستی الله ئاگادارە بەوەی دەیکەن، وە وەک ئەوانە مەبن کە اللەیان لە بیر کردووە وە اللەش خۆیانی لەبیر خۆیان بردۆتەوە، هەر ئەوانەن بەدکاران، دانیشتوانی دۆزەخ و دانیشتوانی بەهەشت وەک یەک نین، هەر دانیشتوانی بەهەشت سەرکەوتوو و ڕزگارن.

بەڵام بەداخەوە هەروەک چۆن هەندێ قوتابی تەمبەڵ لە قوتابخانە خۆیان بۆ تاقیکردنەوە ئامادە ناکەن دەبینین خەڵکێکی زۆر هەن، بێخەم پاڵیان لێداوەتەوە و دانیشتوونە و هیچ خەمێک لە زەخیرەی ڕۆژی قیامەتیان ناخۆن، بەڵام ئەوانیش لە ڕۆژی قیامەت پەشیمان دەبنەوە و دەستی خۆیان دەگەزن بەڵام ئەوکاتە سوودی نیە.

[1] - سورەتی الحشر ئایەتی: ١٨- ٢٠١٠

﴿كَلَّا إِذَا دُكَّتِ الْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا، وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا، وَجِيءَ يَوْمَئِذٍ بِجَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ الْإِنْسَانُ وَأَنَّى لَهُ الذِّكْرَى، يَقُولُ يَا لَيْتَنِي قَدَّمْتُ لِحَيَاتِي، فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُ أَحَدٌ، وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُ أَحَدٌ، يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ، ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً، فَادْخُلِي فِي عِبَادِي، وَادْخُلِي جَنَّتِي﴾[1] واته: نەخێر(بگەڕێنەوە) کاتێ کە زەوی داکوترا کە بە داکوتانێکی توندی یەک لە دوای یەکی، وە پەروەردگارت و فریشتەکانیش پۆل پۆل هاتن، وە لەو ڕۆژەدا دۆزەخ دەهێنرێت (تا کافرەکان ببینن) لەو ڕۆژەدا مرۆڤ یادەوەری ئەکات(و کردەوە بەد و ناشیرینەکانی بیر ئەکەوێتەوە و دەیەوێت تۆبە بکات) بەڵام لە کوێ ئەم یادەوەریە سوودێک بەو ئەدات؟ !دەڵێ خۆزیا لە دونیا کردەوەی چاکەم بۆ ئەمڕۆژە بناردایە، لەو ڕۆژەدا کەس وەکو الله سزای توند و تیژ نادات، وە کەس پێوەندی کەس ناکات وەکو پێوەند کردنی الله (ئەمە سەبارەت بە کافر و دوور لەخوایان، بەڵام ئیمانداران وانین)

ئەی نەفسی کەسی دڵنیا بووی ئیماندار بەڕازی بوویی لێ ڕازیبونەوە، بگەڕێوە لای پەروەردگارت ئینجا بچۆ ڕیزی بەندە چاکە کارەکانمانەوە و بچۆ بۆ بەهەشتی منەوە.

[1] - سورەتی الفجر ئایەتی: ٢١-٣٠

بەڵێ کاتێك دونیا خراپ بوو گەڕاینەوە بۆ لای الله تعالی، ئەو کات هیچ عوزرێکمان قبوڵ ناکرێت، چونکە تازە کار لەکارترازاوە و اللەی خاوەن عەرش تەمەنێکی زۆری پێداین، حەفتا هەشتا ساڵ لە دونیا ژیان، بەڵام هیچ بیرمان نەدەکردەوە کە ڕۆژێکمان لە پێشە دەبێ بمرین و بگەڕێنەوە، بیزانە الله تعالی لە دواڕۆژ بیرمان دێنێتەوە دەفەرمووێ: ئایە ماوەیەکی درێژ تەمەنمان پێنەدان، بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە بۆچی بیرتان نەدەکردەوە.

﴿أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ﴾[١]. واتە: لە وەڵامیاندا الله دەفەرمووێت: ئایا ئەوەندە تەمەنمان پێ نەبەخشین؟ ئەوەی بیەوێت بیرێك بکاتەوە تیایدا بیربکاتەوە؟!

بەڵێ هەتا لە دونیا بوون تەنها کاریان دژایەتی و بێ فەرمانی الله تعالی بوو، هیچ خۆیان ماندوو نەدەکرد لە دونیا کە لە تاقیکردنەوە دانە، بۆیە هیچ بەهانەیەکیان بۆ نیە، الله پرسیارت لێدەکات ئەی بەندەکەم ئایە لە دونیا تەمەنێکی زۆرم پێت نەخشی لە چی بەسەرت برد.!

پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرمووێت: لە ڕۆژی دوایی قاچی هیچ بەندەیەك لە جێگای خۆی ناجوڵێ تا چوار پرسیاری لێ نەکرێت.

[١] - سورەتی فاطر ئایەتی (٣٧)

**(لاتَزُولُ قَدَمُا بْنِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ أَرْبَعٍ: عُمُرِهِ فِيمَاأَفْنَاهُ)**[1]. واتە: لە ڕۆژی دوایی قاچی هیچ بەندەیەك لاناكەوێت تا چوار پرسیاری لێ نەكرێت تەمەنی لە چی بەسەر برد؟.

بۆیە ئەی ئەو كەسەی بەردەوامی لە سەرپێچیكردنی فەرمانی الله تعالى تكایە وریابەوە و خۆت ماندوو بكە بۆ بەدەست هێنانی بەهەشت و لە سنور بەزاندنی الله بترسە چونكە لە قیامەت لە بارەگای اللەی كارزان بێ پشتیوان و بێكەسین مەگەر كەسێك الله تعالى خۆی ڕەحمی پێ بكات.

ئینجا سەیرێكی خۆت بكە بزانە چیت كردوە بۆ الله و لە پێناو الله دا؟! هەر نەبێ گریاوی بۆخۆت بۆ دینەكەت بۆ ژێر گۆرت بۆ قیامەتت، بۆ حاڵی پەشێوی خۆت گریاوی ڕۆژێ لە ڕۆژان، بەڵام وانیە بێخەم پاڵت لێداوەتەوە هیوات درێژە و ئاواتت زۆرە، بەس دڵنیابە هەڵەی و لە داوی نەزانین گیرت خواردووە، بگری بۆ دڵت كە مەیلی تەنها بۆ دونیایەكی كەم و بڕاوایە، سەلەفی ساڵح گریاون لەوەی قاچەكانیان بریندار نەبووە لە پێناو الله لەكاتێكدا ژیانی دونیایان فرۆشت بوو بە ئاخیرەت و هیچ خۆشیان نەبینی لە ژیانیان.

[1] - (رواه الترمذي في كتاب صفة القيامة والرقائق والورع، ٤/ ٦١٢ (٢٤١٧)، والدارمي في المقدمة، ١/ ١٤٤، وأبو يعلى ١٣/ ٤٢٨ (٧٤٣٤).

ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم دەفەرمووێت: یونس کوڕی عبید (ڕەحمەتی اللەی لێ بێ) سەیری قاچەکانی خۆی دەکرد لە کاتی سەرە مەرگدا و دەگریا، پێیان گوت: چی دەتگرییێنێت ئەی باوکی عبدالله؟ فەرمووی: ئەم قاچانەم بریندار نەبوون لە پێناوی الله دا.[1]

کەوایە تاکەی واز ناهێنیت لە سەرپێچکردن و دژایەتی دینی الله و خۆماندوو نەکردن و تێکۆشان بۆ تاقیکردنەوی دونیا، بزانە لە دواڕۆژ هەموو کەس خەمی خۆیەتی ڕزگاری بێت لەسزای الله، هیچ کەس سوودی بۆ کەس نیە تەنها بەرگری لە خۆی دەکات.

**﴿يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَادِلُ عَنْ نَفْسِهَا وَتُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَا عَمِلَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾**[2]. واتە: لە ڕۆژی قیامەت هەموو کەس خەمی خۆیەتی، لەسەر نەفسی خۆی مشتومڕ و دەمەقاڵێ دەکات بەرگری لە خۆی دەکات، پاکانە بۆ خۆی دەکات، گوێ بەکەسی تر نادات، ئەو ڕۆژە هەرکەس پاداشتی کردەوەکانی دەدرێتەوە و ئەو خەڵکە ستەمیان لێ ناکرێت.

[1] ـ بڕوانە: صفة الصفوە_٣_٢١٧

[2] - سورەتی النحل ئایەتی (١١١).

بەڵێ خەمی خۆیەتی ڕزگاری بێت لە ئاگر و سزای پڕ ئێش، حەقی بەکەس نیە خەمی بۆ کەس نیە تەنها خۆی نەبێت، ئینجا هەموو نەفسێك دووشاهێدی لەگەڵە لەڕۆژی دوایی دا، بەڕاستی هیچ عوزر و بیانوویەك نامێنت لە قیامەت بۆ ئەوانەی خراپەکار و دوور لە بەرنامەی ئیسلام سەراپای ژیانی دونیایان بەڕێکرد.

﴿وَجَاءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَائِقٌ وَشَهِيدٌ﴾[١]. واتە: ڕۆژی قیامەت دێت و هەموو کەسێک دوو شاهێدی لەگەڵدایە، یەکێکیان دەیگەیەنێت و ئەوەی تریشیان شایەتە بەسەریەوە.

بەڵێ دوو شاهێدی لەگەڵە یەکیان دەڵێت: ئەی پەروەردگارم فڵانە کەس ئەو تاوانەی کردووە، کەسێکی بەناحەق تووشی کێشە کرد، زوڵمی کرد، نوێژەکانی نەئەکرد، یان ئەو کارە چاکەو خراپەی کرد، بێغەم پاڵی دابوویەوە و هەر خەریکی خۆشی و رابواردن و تێرکردنی نەفسی بوو، ئەوەی تر شاهێدە دەڵێت: ئەی پەروەردگارم ڕاست دەکات من شاهێدم.

بەڵێ هەموو بەڵگەو نهێنیەکانیان لایە، و هیچ پشت و پەنایەکت نیە ڕزگارت بکات چونکە هەرچیت کردووە لە ڕۆژی لە دایك بوون تاکاتی مردن هەموویان نووسیوە، ئەو کاتی رۆژی ئاشکرابوونی گشت نهێنی و شتە شاراوەکانە.

---

[١] - سورەتی ق ئایەتی ( ٢١ ).

﴿يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ﴾[1]. واتە: ئەو ڕۆژەی کە هەموو نهێنیەکان دەردەکەوێت و ئاشکرا دەکرێت.

بەلام بەداخەوە مرۆڤ زۆر بێئاگابوو و لەڕاستی حەق لای دابوو، خۆشی و هەلاو بەزمی دونیا بێ ئاگایی کردبوو لە تێکۆشان بۆ ڕۆژی دوایی.

﴿لَّقَدْ كُنتَ فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَاءَكَ فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ﴾[2]. واتە: بەیەکە یەکەی بێ باوەڕان دەوترێت: بەڕاستی تۆ لەم سەرەنجامە بێ ئاگابوویت و گوێی خۆتت لێ خەواندبوو، ئێستا ئێمە پەردەمان لەسەر چاوەکانت لاداوەو هەموو شتێک وەکو خۆی دەبینیت و ئەمڕۆ چاوەکانت تیژە هەموو شتێك ئەبینی ئەوەی کە لە دونیا لێتەوە نادیار بوو ئێستا هەموو ئەبینی.

بەڵێ جا ئەو کەسەی لە دونیا بۆ الله ژیا و خۆی ماندوو کرد لە تاقیکردنەوە بۆ بەدەستهێنانی بەهەشت، ئامادە نەبوو قیامەتی کە ژیانێکی هەتا هەتاییە بدۆڕێنێ بۆ دونیایەکی کاتی، بەڵێ بە بێگومانی ئەمانە جێگایان بەهەشتە.

[1] - سورەتی طارق ئایەتی (٩).

[2] - سورەتی ق ئایەتی ( ٢٢ ).

﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلًا﴾[1]. واته: بەڕاستی ئەوانەی كە ئیمان و باوەڕیان هێناوەو كردەوەی چاكەیان ئەنجامداوە، ئێمە هەر لە زووەوە بەهەشتی فیردەوسمان بۆ ئامادە كردوون، تا لەوێ دابەزن و ژیانی كامەرانی تیایدا بەرنەسەر.

بە پێچەوانە ئەوانەی سەرتاپای ژیانیان بێفەرمانی الله تعالی بوو، هەموو ئامانجیان دژایەتی ئیسلام و موسڵمانان بوو، ئاگری دۆزەخ شوێنیانە.

﴿فَأَلْقِيَاهُ فِي الْعَذَابِ الشَّدِيدِ﴾[2]. واتە: كەواتە ئێوە هەردووكتان ئەو ئادەمی یە فڕێ بدەنە ناو سزای زۆر سەختەوە.

چونكە ئەوانە دژایەتی دینی ئیسلامیان كردووە و بوونەتە دڕكو و داڵی سەر ڕێگای بانگخوازانی ڕێگای یەكخواپەرستی (التوحید)، ئەی ئەوانەی شەو و ڕۆژتان داناوەتە سەر یەك بۆ دژایەتی ئیسلام و موسڵمانان، ئەی ئەوكەسانەی دڵتان بە دونیاییەكی كاتی خۆشە، ئەی گەنجەكان ئەوانەی ماوەیەكە بەخۆتان ئەنازن وازتان هێناوە لە تێكۆشان بۆ دواڕۆژی نەبڕاوە، با كەمێک بیر بكەینەوە لەگەڵ هۆش و ئەقڵمان، بۆ ئەو ڕۆژەی دەگەڕێینەوە بارەگای اللەی كارزان، زانیمان ئەوانەی لە دونیا خۆیان ماندو نەكرد ئاگر پاداشتیانە (پەنا بە الله)، جا بیربكەوە لەوكاتەی بەرەو ئاگری دۆزەخ ڕادەكێشرێن و بەڕێ دەكرێن.

[1] - سورەتی الكهف ئایەتی (١٠٧).

[2] - سورەتی ق ئایەتی ( ٢٦ ).

﴿وَيَوْمَ يُحْشَرُ أَعْدَاءُ اللَّهِ إِلَى النَّارِ فَهُمْ يُوزَعُونَ﴾[1]. واتە: ئەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ باسی ئەو ڕۆژە بكە بۆ گەلەكەت كە نەیارو دوژمنانی الله بەرەو ئاگری دۆزەخ كۆ ئەكرێنەوە جا بەڕیز ڕائەگیردرێن و دەستە دەستە بەڕێدەكرێن بۆ ئاگر.

بەڵێ لەو كاتە كەسێك نیە ڕزگارمان بكات لەو ناخۆشی و سزاییە، بەڵكو ئەندامانی لاشەمان شاهێدی لەسەر سەرجەم خراپەكاریەكانمان دەدەن.

﴿حَتَّىٰ إِذَا مَا جَاءُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَارُهُمْ وَجُلُودُهُمْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[2]. واتە: كاتێك كە لە ڕۆژی قیامەتدا دێن و ڕادەگیرێن و الله تعالى مۆر ئەدات لەسەر زمانیان، وە گوێ و چاو و پێستیان شایەتیان لەسەر ئەدەن لەو كردەوە خراپانەی كە كردوویانە.

بەڵێ هەموو ئەندامانی لاشەمان شایەدن لەسەر كردەوەكانمان، زمان لەسەر درۆ، غەیبەت، بوختانكردن بۆ موسڵمان، چاو لەسەر سیخوڕی و جاسوسیكردن، نەزەر كردن، هەر هەموو لاشەمان دێنە گۆ گەواهی ئەدەن لە بەرامبەر اللهی خاوەن عەرەش، بزانە لەو كاتە خراپەكاران هەڵوێستیان چی دەبێت بەرامبەر لاشەیان كاتێ هەموو شتێك ئاشكرا دەكەن.

﴿وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدْتُمْ عَلَيْنَا﴾[3]. واتە: بە گلەییەوە لۆمەی پێستەیان دەكەن ئەڵێن: بۆچی بە زیانی ئێمە گەواهیتاندا ؟ خۆ ئێمە لەئێوە بەرگری ئەكەین!.

پاك و بێگەردی بۆ الله بەڵام لاشەیان هەموو كار و كردەوەیەكی نهێنی و ئاشكرا دەخاتە ڕوو، ئینجا بزانە ئەندامەكانی دەبێت وەڵامی چی بێت.

---

[1] - سورەتی الفصلت ئایەتی (١٩).

[2] - سورەتی الفصلت ئایەتی (٢٠).

[3] - سورەتی الفصلت ئایەتی (٢١).

**﴿قَالُوا أَنْطَقَنَا اللَّهُ الَّذِي أَنْطَقَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾**[١].

واتە: ئەڵێن: ئەو اللەی کە هەموو شتێکی هێناوەتە قسەو گۆ، ئێمەیشی بەقسە هێنا. واتە: بە ئارەزووی خۆمان نەبوو، ئیتر بۆچی گلەییمان لێ ئەکەن؟ هەر ئەویشە بۆ یەکەمجار لەنەبوونەوە ئێوەی بەدیهێنا و هەر بۆلای ئەویش دەگێڕدرێنەوە.

ئیمامی موسلیم لە هاوەڵی ئازیز ئەنەسەوە (ڕەزای الله تعالی لێ بێت) ئەفەرمووێ: جارێك پێغەمبەری پێشەوا ﴿ﷺ﴾ پێکەنی! فەرمووی: **(هَلْ تَدْرُونَ مِمَّ أَضْحَكُ؟)** ئایا ئەزانن لەبەرچی پێ ئەکەنم؟!،

گوتمان: الله تعالی پاشان پێغەمبەرەکەی﴿ﷺ﴾ ئەزانن، فەرمووی: **(مِنْ مُخَاطَبَةِ الْعَبْدِ رَبَّهُ يَقُولُ : يَا رَبِّ أَلَمْ تُجِرْنِي مِنْ الظُّلْمِ ؟ قَالَ يَقُولُ بَلَى. قَالَ فَيَقُولُ فَإِنِّي لَا أُجِيزُ عَلَى نَفْسِي إِلَّا شَاهِدًا مِنِّي،قَالَ فَيَقُولُ: كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ شَهِيدًا، وَبِالْكِرَامِ الْكَاتِبِينَ شُهُودًا. قَالَ فَيُخْتَمُ عَلَى فِيهِ فَيُقَالُ لِأَرْكَانِهِ: انْطِقِي، قَالَ فَتَنْطِقُ بِأَعْمَالِهِ قَالَ ثُمَّ يُخَلَّى بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْكَلَامِ قَالَ فَيَقُولُ: بُعْدًا لَكُنَّ وَسُحْقًا فَعَنْكُنَّ كُنْتُ أُنَاضِلُ )**[٢]. واتە: لە قسەو گفتوگۆی بەندەیەك لەگەڵ الله تعالی ئەڵێ: ئەی پەروەردگارم ئایا بڕیار نەبوو لە ستەم پەنام بدەیت. الله تعالی ئەفەرمووێ: بەڵێ بڕیار وابوو!

ئەوسا بەندەکە ئەڵێ: دە من بۆ ئەوە لە خۆم نەبێ شایەد قبووڵ ناکەم، الله تعالی ئەفەرمووێ: هەر خۆت بەشایەت بەسیت، ئەڵێ: ئەوجا مۆر لەسەر دەمی دەدرێ، جا بەئەندامەکانی لاشەی دەوترێ: ئادەی ئێوە قسە بکەن! ئەوانیش

[١] - سورەتی الفصلت ئایەتی (٢١).

[٢] - بڕوانە: مسلیم. ژمارەی فەرمووده: ( ٥٢٧١).

دێنە قسەو، مۆڵەت دەدرێ، ئەوجا پێیان ئەڵێ: دەك دوور بن لە رەحمەتی اللەوە دوور بن و تیابچن، خۆ من لەئێوە دیفاع و بەرگریم ئەکرد.

ئینجا براو خوشکانی من با لە ئیستاوە واز لە دژایەتی بەرنامەی ئیسلام و تاوانکردن بێنین کە دەبنە هۆی چوونە ئاگری دۆزەخ پەنا بە اللە تعالی.

ئاخۆ بیرت کردۆتەوە ٢٠ ساڵی تر تۆ دەمێنی یان چ کەسێکت لە دەست ئەدەی بۆچی خۆت تەسلیمی اللە ناکەی کەئەزانی بوونت لەم ژیانەی دونیا تاسەر نیە بەسە بەئاگا وەرەوە پێش ئەوەی مەرگ ببێتە میوانت.

خۆشبەحاڵی ئەوەی دڵی بەم ژینەی فانی و کاتیە خۆش ناکا و هەڵناخەلەتێ دڵخۆشبوونی ڕاستەقینەی لە دواڕۆژی نەبڕاوەی بەهەشت ئەبینێتەوە، بۆیە هەوڵی چاکە و چاکەکاری ئەدات لەم ژیانەی کاتیە بۆ بەهەشتێکی هەمیشەیی.

با موحاسەبەی نەفسی خۆمان بکەین، خۆمان ماندوو بکەین بۆ ئەو تاقیکردنەوەی ژیانی دونیا و ڕێگری لە نەفسمان بکەین لە کاری خراپ و سنور بەزاندنی سنوری اللە تعالی، پێش ئەوەی بەهۆی کردەوەکانمان لێپرسیەوەمان لەگەڵ بکرێت و، سزا بدرێن بە ئاگری دۆزەخ، کەوابوو تا لە ژیانین نەمردووین بابگەڕێینەوە بۆ ڕاستە شەقامی بەرنامە جوانەکەی ئیسلام، با هەمیشە قیامەت و ترسی اللە تعالی مان لە بیر بێت، تا لە دواڕۆژ ئەندامەکانی لاشەمان شایەتی چاکەمان بۆ بدەن و دووربین لە ئاگری دۆزەخ و بۆ ئەوەی بەهەشتی نەبڕاوە مسۆگەر بکەین بە ویستی اللە تعالی.

## سەرەنجامی کەسی ئیماندار و بێ باوەڕ چیە

ئەم ژیانەی دونیا مانەوەی تێیدا بۆ مرۆڤەکان پاشەڕۆژ و سەرەنجامێکی ڕوونی نیە جێگای ئومێد و دڵخۆشی بێت بەوەی ژیانی هەمیشەی ببەیە سەر، بەڵکو مانەوەی گشت خەڵکی کاتییەو ڕۆژێکی بۆ دیاری کراوە، بەفەرمانی الله تعالی بۆ دەرچوون لەم دونیایە بۆ شوێن و مەنزڵگای هەمیشەیی کە قیامەتە.

﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَنْ تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ كِتَابًا مُؤَجَّلًا﴾[١]. واتە: وە هیچ کەسێکیش نیە کە بمرێ تەنها بە ئیزنو فەرمانی الله تعالی نەبێ کە نووسراوە و کاتەکەی دیاریکراوەو پێش‌و دوا ناکەوێ.

ئینجا لە قیامەت دوو شوێن و جێگا ئامادە کراون، بۆ دوو دەستە لە خەڵکی، دەستەو کۆمەڵی الله تعالی، پاشان دەستەی بێ بڕوایان و تاوانباران، لە بری چاکەکردن لە تاقیکردنەوەی ژیانی دونیا بۆ ڕەزامەندی اللەی خاوەن عەرش، وە لە بری سەرپێچی و فەرامۆشکردنی فەرمانەکانی الله تعالی، و گرتنەبەری ڕێگای گومڕایی و دژایەتی ئایینی ئیسلام و موسڵمانان، ئەم دوو شوێنە ناونراون بە (بەهەشت)، (جەهەننەم).

﴿وَتُنْذِرَ يَوْمَ الْجَمْعِ لَا رَيْبَ فِيهِ فَرِيقٌ فِي الْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي السَّعِيرِ﴾[٢]. واتە: ئەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بیان ترسێنە لە ڕۆژی قیامەت کە ڕۆژی کۆکردنەوەی سەرجەم خەڵکییەو هیچ گومانێکی تیادا نیە لەو ڕۆژەدا خەڵکی ئەبنە دوو کۆمەڵ:

---

[١] - سورەتی ال عمران ئایەتی (١٤٥).

[٢] - سورەتی الشوری ئایەتی (٧).

کۆمەڵێك بۆ بەهەشت کە باوەڕدارانن، وە کۆمەڵێکیش بۆ ئاگری سووتێنەری دۆزەخ کە بێباوەڕانن.

ئینجا ژیان بەسەربردن لەم دوو شوێنە ڕوونە و سەرەنجام و پاشەڕۆژی دیاری کراوی هەیە کە مانەوەی هەمیشەییە.

هەر کەسێك خۆی ماندوو نەکردبێ بۆ تاقیکردنەوەی ژیانی دونیا سەراپای ژیانی تاوان و دژایەتی دینی ئیسلام بێت، هەمیشە لە هەوڵی پیلان و تەڵەکەبێ بۆ موسڵمانان، دڵی ڕەشبێ بەرامبەریان الله تعالی ئاگر دەکاتە شوێنی مانەوەی.

﴿بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَاطَتْ بِهِ خَطِيئَتُهُ فَأُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾[1]. واتە: نەخێر وانییە، ئەو کەسەی گوناهو تاوان ئەنجام بدات و تاوانەکانی هەموولایەکی دابگرێت (ئاشکراو نادیاری) ئەو جۆرە کەسانە نیشتەجێی ئاگری دۆزەخن و بۆ هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە.

بەڵام بە پێچەوانە ئەو ئیماندارەی تەمەنی خۆی لە دونیا بۆ ڕەزامەندی الله تعالی و لە خزمەتی ڕێبازی تەوحید پیر کرد، گشت کاروکردەوەیەکی تەنها بۆ ڕەزامەندی الله بوو بە دڵسۆزی، بێوچان تێکۆشانی دەکرد لە ژیانی ئەوە الله تعالی پاداشتیان بە باشترین شێوە دەداتەوە لە دوواڕۆژ.

﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾[2].

واتە: ئەو کەسانەش باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکان ئەنجام دەدەن، هەر ئەوانن نیشتەجێی بەهەشتن و تیایدا ژیانی هەتا هەتایی دەبەنە سەر.

---

[1] - سورەتی البقرة ئایەتی (٨١).

[2] - سورەتی البقرة ئایەتی (٨٢).

بڕواداری ڕاستگۆی شوێنکەوتەی سەر ڕاستی ئیسلام لە ژیانی دونیا بۆ سەرەنجامێکی نەبڕاوە تێدەکۆشێ، لە تاقیکردنەوەی دونیا هەوڵ و تەقەلا دەکات بە دڵسۆزی بۆ گەیشتن بە ئارامگای دواڕۆژ کە بەهەشتە، چونکە دەزانێ بەمانەوە تێیدا ژیانێکی هەمیشەیی بۆ هەیە، لە بەرامبەر ژیانی کەمی دونیا کە بەردەوام لە برسی بوون و نەبوونی و خەم و خەفەت دایە، بەڵێ بۆ ئەو بەهەشتە تێدەکۆشێت کە خۆشی و ناز و نیعمەتەکانی بێ کۆتایین، هەروەك پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) لەو بارەیەوە دەفەرمووێ:

**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ يَنْعَمُ لاَ يَبْأَسُ، لاَ تَبْلَى ثِيَابُهُ وَلاَ يَفْنَى شَبَابُهُ)**[1]. واتە: ئەبو هورەیرە (ڕەزای الله تعالی لێ بێت) دەفەرمووێ: پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) فەرموویەتی: هەر کەس بچێتە بەهەشتەوە هەمیشە بەهرەمەند دەبێت و تەنگ ژیانی بەسەردا نایەت، نەجل وبەرگی داڕزاو دەبێت و نەتافی لاویشی بەسەر دەچێت.

بۆیە ئەزانێت ئەم ژیانەی دونیایە کاتییە و بۆ تاقیکردنەوە الله تعالی دروستی کردووینە و ڕۆژێکمان لە پێشە دەبێ بگەڕێتەوە بۆ لای اللەی خاوەن عەرش، بۆیە هەوڵدەدات و خۆی ماندوو دەکات بۆ تاقیکردنەوەی دونیا و هەمیشە بۆ سەرکەوتن تێدەکۆشێت، چونکە زانیویەتی الله تعالی پەیمانی داوە بەوانەی کە تەنها بەندایەتی بۆ ئەو دەکەن بەهەشت و ناز و نیعمەتەکەی دەکاتە خەڵاتییان. هەر بۆیە ئەهلی بەهەشت، کە چوونە ناو بەهەشت، دەپرسن لەوانەی لە دونیا خۆیان ماندوو نەکرد لە تاقیکردنەوە و تێکۆشان بۆ ڕەزامەندی الله تعالی و بەردەوام لە بێئاگایی و دژایەتی ئیسلامیان دەکرد، گاڵتەیان دەکرد بە ئیسلام و

[1] - (صحیح مسلم - الجنة وصفة نعيمها وأهلها، ژمارەی فەرموودە: (٢٨٣٦).

موسڵمانان، باوەڕیان بە قیامەت و مردن نەبوو، پێیان دەڵێن: ئایە اللەی خاوەن عەرش ئەو بەڵێنەی پێدابوون لە دونیا کە بەندایەتی بۆ نەکەن و پابەندی بەرنامەی ئیسلام نەبن و تاقیکردنەوەی دونیا بەکەم بزانن شوێنتان ئاگری دۆزەخ دەبێ، ئایە گەیشتن بە پەیمانی اللەی کارزان کە جێگاتان ئاگر دەبێ ؟! ئێمە وا لە بەهەشتین بەلێنی اللەی خاوەن عەرش ڕاست و حەق بوو پاداشتی خۆمان وەرگرت.

﴿وَنَادَىٰ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابَ النَّارِ أَن قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا قَالُوا نَعَمْ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنٌ بَيْنَهُمْ أَن لَّعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ﴾[1]. واتە: پاشان نیشتەجێیانی بەهەشت بانگی نیشتەجێکانی دۆزەخیان کرد: بەڕاستی ئەو بەڵێنەی کە پەروەردگارمان پێی دابووین دەستمان کەوت و پێی بەخشین، ئایا ئێوەش ئەو بەڵێنەی کە پەروەدگارتان دابووی بەڕاستی دەستان کەوت؟! (لە وەڵامدا بەدڵ شکاوی و غەم و پەژارەیەکی زۆرەوە) گوتیان: بەڵێ. ئەوسا جارچیەك جاڕیدا لە نێوانیاندا و هاواری کرد: نەفرەتی الله لە ستەمکاران بێت.

بەڵێ ئەو کەسەی ژیان و خەم و ماندووبونی لە دونیا بۆ ئەوە بوو لە تاقیکردنەوەی الله تعالی سەرکەوتوو بێ و هەمیشە گوێڕایەڵی فەرمانی الله بوو، خەمی ئەو بۆ ماڵی دونیا و خۆشییەکانی خانوی کامڵ مواسەفات و سەیارەی مۆدێل بەرز، بوون بە خاوەنی کارگە و شوقە و شوێنی گەشتیاری نەبوو، بەڵکو خەم و خەفەتی ئەو لە دونیا ئەوە بوو لە تاقیکردنەوەی الله لە ژیان سەرکەوتوو

[1] - سورەتی الاعراف ئایەتی (٤٤).

بێت و خۆی دەپارێزێ لە بە پێشێلکردنی فەرمانەکانی الله، هەمیشە هەوڵ دەدات بە دڵسۆزی و نیەت پاکی عیبادەت و بەندایەتی ئەنجام بدات، زەخیرەی چاکە و کردەوە باشەکانی بە خشوع و تەقوا لە قوتابخانەی ئیسلام بۆ پاشەڕۆژی ڕەوانە بکات تا سەرفرازی بەدەست بێنێ، گەر خاوەنی هیچ نەبێ لە ژیانی دونیا ژەمە خواردنێکی خۆش یا قەنەفەو کورسی مۆدیل بەرز و نەرم، سەیارە و خانوی چەندان قاتی بەڵکو خانویەکی هەبێ بیپارێزێ لە سەرما و گەرما ڕایەخێکی تێدابێ لەسەری دابنیشێ تەواو، بۆیە لای الله بەرنادات هەمیشە بەندەی اللەیە، ئەم جۆرە کەسانە سەرەنجامیان تەنها بەهەشتە.

﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَأَخْبَتُوا إِلَىٰ رَبِّهِمْ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾[١]. واتە: بەڕاستی ئەوانەی بڕوایان هێناوە و کردەوە چاکەکانیشیان ئەنجامداوەو گەڕاونەتەوە بۆ لای پەروەردگاریان و ملکەچ و دڵ ئارام بوون لە بەرامبەر فەرمانەکانی، ئا ئەوانە خاوەن و نیشتەجێی بەهەشتن و بە هەتا هەتایی تیایدا دەمێننەوە.

بۆیە ئەی بەندەی الله بزانە بۆ بە دەست هێنانی ڕەزامەندی الله تعالی و بەهەشت دەبێ لە تاقیکردنەوەی دونیا هەوڵ و تێکۆشان و ماندووبونی بۆ بدەی، تەنها قسە نەبین بەبێ کردەوە، بەڵکو دەبێ کردەوەشمان هەبێت، تاوەکو بەهەشت بەدەست بێنین، بزانە چۆن الله تعالی باسی ئەوانە دەکات، کە لە بەهەشت گفتوگۆ دەکەن لەگەڵ یەکتر، کە لە ژیانی دونیا چۆن بۆ الله ژیان چەن ئەزیەت

[١] - سورەتی هود ئایەتی (٢٣).

و ناڕەحەتیان چەشتوە و، چەند ماندوو هیلاك بوون بە تاقیکردنەوە و ئەزیەت و ئازاردران لەسەر دینی ئیسلام.

﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ﴾[1]. واتە: وە هەندێك لە بەهەشتییەکان ڕوو ئەکەنە هەندێکیان وە پرسیار لە یەکتری ئەکەن دەربارەی کردەوەکانی دونیایان. بەڵێ دەربارەی کردەوەکانیان قسە لەگەڵ یەکتر دەکەن، لە دونیا کە کردوویانە، خۆزگە دەخوازن خزم و دۆستەکانیان ڕێگای ڕاستیان گرتبایە بەر، تاوەکو ئەوانیش لەو خۆشیە لەگەڵیان بونایە، بەڵام ئەوان گوێڕایەڵ نەبوون بۆ بەرنامەی ئیسلام بۆیە سەرەنجامی خۆیان وێران دەکەن.

﴿قَالُوا إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِي أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ﴾[2]. واتە: سەرەنجام هەموو بەیەک دەنگ دەڵێن: بەڕاستی ئێــمە پێشتر لەناو کەسوکاری خۆماندا لە دونیادا لە سزای الله تعالی ئەترساین، هەروەها بەبەزەییش بووین لەناویاندا و مەبەستمان بوو ئەوانیش وەك ئێمە یەکخواپەرست بن.

ئیمانداران لە دونیا کاتێك ڕێگای الله تعالی بیری خەڵك دێننەوە، کە دووربن لە تاوان و سەرپێچیکردنی فەرمانەکانی، بۆ ئەوەیان بوو تاوەکو گشت خەڵکی دووربن لەسزا و ئازاری دواڕۆژ و بەهەشت شوێنیان بێ.

[1] - سورەتی الطور ئایەتی (٢٥).

[2] - سورەتی الطور ئایەتی (٢٦).

﴿فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَانَا عَذَابَ السَّمُومِ﴾[1]. واتە: بەهۆی ئەوەوە الله تعالی نیعمەتی خۆی ڕژاند بەسەرماندا وە لێمان خۆشبوو وە ڕەحمی پێ کردین و پاراستمانی لە سزای ئاگری دۆزەخ کە سزایەکە چۆن بایەکی گەرم هەڵ ئەکات بەو شێوازە گەرمییەکەی یەکجار سەختە.

بۆیە تاکو گەنجین و تواناما‌ن هەیە با لە خەوی غەفڵەت بە ئاگابێینەوە، و خۆمان ماندوو بکەین بۆ تاقیکردنەوەی ژیانی دونیا و ڕێگای ڕاستی ئەم ئیسلامە بگرین، کە تاکە ڕێگایە بۆ خۆشبەختی دونیا و دواڕۆژ، تاوەکو سەرەنجامان بەهەشتی پڕ نازو نیعمەت و خۆشی بێت، با لە دونیا تەنها بەندە اللهی خاوەن عەرش بین و بۆ ئەو بژین بەڕاست و دروستی و لەو تاقیکردنەوەی کە لە ژیانی دونیا داین خۆمان ماندوو بکەین، و بەڵێن بە الله بدەین لێدانی دڵمان بۆ جگە لە ئەو نەبێت، بۆ ئەوەی لە دواڕۆژ لەوانەبین کە بەڕێ دەکرێن بۆ دیداری اللهی خاوەن عەرش.

﴿ يَوْمَ نَحْشُرُ الْمُتَّقِينَ إِلَى الرَّحْمَنِ وَفْدًا ﴾[2]. واتە: ڕۆژێك دێت ئێمە دەستە دەستە یەکخواپەرست و پارێزگاران بۆ لای اللهی میهرەبان بە ڕێ دەکەین تا بەدیداری شادبین و بیانخاتە بەهەشتەوە.

با لەو کەسانە نەبین کە بەرەو ئاگری سوتێنەری دۆزەخ دەیان بەن، بەهۆی خۆماندوو نەکردنیان لە تاقیکردنەوەی دونیا و زۆری تاوان و دژایەتیان بۆ بەرنامەو یاسای ئیسلام .

---

[1] - سورەتی الطور ئایەتی (٢٧).

[2] - سورەتی مریم ئایەتی (٨٥).

﴿وَنَسُوقُ الْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا﴾[1]. واته: خراپەکارو گوناهکارانیش بەپەلەو بەتینویەتی ڕاپێچ دەکەین بۆ ناو دۆزەخ.

بەڵام ئەوانەی گشت تەمەنیان لە دونیا بۆ ڕەزامەندی الله تعالی بردە سەر، و لە تاقیکردنەوەی دونیا زۆر خۆیان ماندوو کرد، و ئازار و ژانی زۆریان هاتە ڕێ لە پێناو ئیسلام، کاتێك دەچنە بەهەشت دەڵێن: ﴿وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي صَدَقَنَا وَعْدَهُ وَأَوْرَثَنَا الْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَاءُ فَنِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ﴾[2]. واته: ئەوسا ئیتر ئەو بەختەوەرانە دەڵێن: سوپاس و ستایش بۆ ئەو اللهی، کە بەڵێنی خۆی بۆمان بردە سەر و کردینی بەخاوەنی سەرزەمینی بەهەشت و لە هەرشوێن و لە جێیەکیدا بمانەوێت سەربەستانە ژیان دەبەینە سەر، ئای چەندە پاداشتی تێکۆشەران و خەباتکاران چاك و پاك و بەنرخە.

بۆیە ئەی بەندەی الله تاکو نەمردوی و لە ژیانی لەو تاقیکردنەوەی دونیا زۆر ئاگاداربە هەڵێکە بۆت، نەکەی سەرەنجامت وێران بکەی بە دژایەتی کردنت بۆ ئیسلام و موسڵمانان، تاکو زووە خۆت ئامادەی ئەم گەشتە دوور و درێژەی دواڕۆژ بکە، جانتای گەشتەکەت پڕ بکە لە کردەوەی چاکە، تاکو لە قیامەت بۆت بێتە توێشوو تا جێگای هەمیشەیت بەهەشتی فیردەوس بێت، بە ویستی الله تعالی.

[1] - سورەتی مریم ئایەتی (٨٦).

[2] - سورەتی الزمر ئایەتی(٧٤).

## چەن نموونەیەك بۆ بەرچاو ڕوونی لە تێکۆشان بۆ دواڕۆژ

سەرەتا ئەو کەسەی لە ژیانی دونیا چ پیاو، چ ئافرەت ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان ڕۆیشتبێتە قوتابخانە ئەوە زۆر چاک دەزانێت بۆ تاقیکردنەوەکان هەموو جار کە مامۆستا دەهات بۆ پۆل، ڕۆژێکی بۆ قوتابیەکان دیاری دەکرد و دەیگوت قوتابیە ژیرەکانم ئاگاداربن لە فلانە ڕۆژەدا تاقیکردنەوەمان هەیە، ئینجا لەگەڵ ئاگادار کردنەوەی قوتابیەکان لە لایەن مامۆستاوە، بە گوێرەی خەمیان بەرامبەر ئەم تاقیکردنەوەیە و خۆ ئامادەکردن بۆی دەبنە دوو دەستەی سەرەکی، بەشێکیان هەر لەو کاتەی مامۆستا ئەو هەواڵەیان دەداتێ، کە خۆیان ئامادە بکەن و هەول بدەن و ئەوکاتە ڕائەچلکێن وەکو هەورە تریشقە خەم دەیانگرێ و ئیتر هەر لەم ڕۆژەوە، لەگەڵ ئاگادارکردنەوەیان کە دەچنەماڵەوە و ڕۆژ بەڕۆژ هەوڵی خۆیان دەدەن و خوێندنی خۆیان دەکەن و بەرە بەرە خۆیان ئامادە دەکەن، وە لە پێناو ئەم تاقیکردنەوەیە واز لە یاری و گەڕان و سووڕانەوە و خۆ خەریک کردن بە شتانێك دەهێنن کە دووریان دەخاتەوە لە کۆشش کردن، و بەردەوام خەمیانە بۆ ئەوەی نمرەی بەرز بەدەست بێنن، یەک خولەك بەبێ ئیشی بە فیرۆ نادەن و زۆر بەجوانی خۆیان بۆ ئامادە دەکەن.

بۆیە کە ڕۆژی تاقیکردنەوەکە دادێ، ئەم دەستەیە زۆر بەسەربەرزی دەچنە هۆلی تاقیکردنەوە و بەبێ هیچ منەتێک و بە سەربەرزی و ئاسوودەیی وەڵامی خۆیان دەدەنەوە و سەرکەوتوو دەبن.

بەڵام دەستەی دووەمیان کە مامۆستا باسی تاقیکردنەوەیان بۆ دەکات وەک ئەوە وایە بایەک بە بنی گوێیان دابدات و بەئاگایان ناهێنێ و هیچ حساب بۆ قسەی مامۆستا ناکەن، وەکو کۆمەڵی یەکەم ژیان و خۆشی و ڕابواردنی خۆیان ناگۆڕن بەوەی بکەونە سەر خوێندن و کۆشش کردن، وە لەو ڕۆژانەی پێش تاقیکردنەوە واز لە یاری کردن و موبایل و پۆبچی و چوونە بازاڕ و گەڕان و سووڕان بێنن لەبەر خاتری تاقیکردنەوە.

جا ئەم کۆمەڵەی دووەم لەگەڵ ئەوەی گشت خۆشی و ڕابواردن و گەڕان و هەلاو بەزمیان ئەنجامدا، و بێخەم لێیان پاڵدابویەوە چارەنووسیان بە ساقیت بوون دەگات، بەڵام دەبێ بزانین بۆ هەر یەکیان هۆکارێکی جیا هەبووە، کە وای لێ کردوون تاقیکردنەوەکە بە گرنگ نەزانن و بە سادەیی وەری بگرن و پێیان هیچ نەبێ و حسابی بۆ نەکەن، کە ئەم خالانەی خوارەوەن.

* هەندێ کەس دەڵێ: مامۆستامان دڵی نەرم و پڕ بەزەییە، پیاوی باشە و خراپەی نیە بۆمان دەرم ئەچێنێ و یارمەتیم دەدات، ئینجا بێخەم لێی پاڵ دەداتەوە بەتەمای ئەوەی بەزەیی مامۆستا فریای بکەوێ.

* هەندێ کەس هەیە تاقیکردنەوەی ئەوەندە بە شتێکی گرنگ نایەتە بەرچاو کە لەپێناویدا خۆی بۆ ماندوو بکات و واز لە هەندێ خۆشی و یاری کردن و ڕابواردن بێنێت و هەندێ شەوان بۆی نەخەوێ، دەڵێ: شەو نەخەوم و نەچم دەستێ یاری لەگەڵ هاوڕێکەم بکەم و یان سەیرێکی لیستی چاتەکانم نەکەم بزانم کێ نامەی ناردووە و یان سەیری فیلمی دۆبلاژکراو نەکەم چیە لە تاقیکردنەوە دەربچم؟ ئەوە بە من ناکرێت واز لەو شتانە بهێنم!

* هەندێ کەس هەیە خۆشیەکانی ژیانی ڕۆژانەی بە ئەنجامی تاقیکردنەوەکە دەگۆڕێتەوە و دەڵێ: گەنجم با من جارێ بە ئارەزووی خۆم بگەڕێم و تێر خۆشی ببینم بە خوێندنەکەوە ماندوو نەبم، ئینجا دەرئەچم یان نا ئەوە بە جەهەنەم، ئەو بیرەشیان لەگەڵ بیری دووەمی پێشوو جیاوازە، چونکە ئەوانە بە پێچەوانەی ئەوانی تر تاقیکردنەوە و ئەنجامەکەی بە گرنگ تێدەگەن، بەڵام چیە؟ ئەوەیە بەخۆشی و ڕابواردن نایگۆڕنەوە، و منەتیان بە تاقیکردنەوەکە نیە.

* هەندێ کەس هەیە دەڵێ: من دڵێکی پاکم هەیە، بۆیە وا گومان دەبات خۆی پێ پاکە و دەڵێ مرۆڤی پاکیش لە هەموو جێگایەک بەختی بۆ دێت و مەرج نییە سەعی بکات و هەوڵ بدات، ئینجا لە هۆڵی تاقیکردنەوەکە بەو گومانەی خۆی بێخەم وەڵام دەداتەوە، وەڵامەکان ڕاست بن یان نە گرنگ نیە بەلای ئەو.

* هەندێ کەس هەیە خزم و ناسیاوێکی مامۆستاکەی دەناسێ، بەتەمای ئەوەیە بەهۆی ئەوەوە واستەیەک لای مامۆستا بکات و دەربچێت!

* هەندێ کەس هەیە بەتەمای ئەوەیە هاوڕێکانی لە ژووری تاقیکردنەوە یارمەتی بدەن و وەڵامەکان هەندێکی پێ بڵێن و گرنگ ئەوەیە تەنها دەربچێ نمرەی کەمیش بێت کێشە نیە، جا هەر لەسەر ئەو بیرە کە هاوڕێکانی پێی بڵێن لێی پاڵ دەداتەوە.

* هەندێ کەس هەیە بێ ماندوبوون و هەوڵدان لێی دادەنیشێ، دەڵێ با جارێ خۆشی و ڕابواردن ببینم و کە مامۆستا دووبارە تاقیکردنەوەی پێ کردینەوە بۆ دەوری دووەم و لەو جارەدا لێبڕاوانە هەوڵی خۆم ئەدەم بۆ ئەوەی دەربچم، کەمێ باخۆشی ببینم خودا گەورەیە بۆ خولی دووەم.

* هەندێکیان لەبەر مەژغولی یاری کردن و گەڕان و سووڕان و شتی بێسوود تاقیکردنەوەکەی لەبیر دەچێت، تا نەچێتە ژووری تاقیکردنەوە بە بیری نایەتەوە کە ئەمڕۆ تاقیکردنەوەییە.

* هەندێ کەس نیاز و نیەتی ئەوەی هەیە لەناو تاقیکردنەوەکە فێڵ (قۆپیە)ی بکات، بۆیە بە دڵ خۆشی و لوت بەرزیەوە، گەران و سووڕانی خۆی دەکات چونکە بە تەمای (قۆپیە) ئینجا بێخەم لێی پاڵ ئەداتەوە.

* هەندێکیان کوڕی پیاوێکی بەرپرس و خاوەن دەسەڵات و پاسەوانی زۆرە، پشتی بەوە دەبەستێ کە ئەو دەسەڵاتەی باوکی لە دەرنەچوون بیپارێزێ، یان کوڕی ئاغا یان پیاوێکی گەورەی ناو کۆمەڵگایە یان کوڕی سەرۆک عەشیرەت و هۆزێکە و لەو باوەڕەدا نییە و مامۆستاکەی بوێرێ قوتابیەکی لە نموونەی ئەو

دەرنەچێنێ، یان کوڕی پیاوێکی دەوڵەمەندە و یاری بە پارە و پول دەکات، هەروا دەزانێ ئەو پارە و سامانەی باوکی سەرکەوتنی بۆ دەکڕێ.

ئەم نموونانەی باس کران هەڵوێستی قوتابیان بوو بەرامبەر تاقیکردنەوەی قوتابخانە، بەڵام ئایە هەڵوێستی خەڵکی بە گشتی بەرامبەر تاقیکردنەوەی ژیانی دونیا چۆنە کە الله تعالی مرۆڤی لەو پێناوەدا بۆ دروستکردووە؟!

بەشێکی خەڵک هەر لەو کاتەی لە ژیان تێدەگەن و دەزانن وا لە ناو تاقیکردنەوەی الله تعالی دان، زۆر ژیر و ئاقلانە دەست دەکەن بە هەوڵدان و ماندوو بون و پێشخستن و کۆکردنەوەی توویشوی چاکە بۆ ڕۆژی دوایی، و ناهێلن کاتەکانی بەشتی بێسوود بە فەیرۆ بڕوات.

ئەمەش نموونەیەك لە ژیانی کەلە پیاوە ژیر و چاکەکانی پێشـــینی ئوممەت کە چۆن نەیان هێشـــتووە ســـاتێکی کەمی ژیانیان لێ بڕوات کە ناوی الله تعالی تێدانەهێنن.

**(عن عبدالله بن أحمد حنبل قال: ( كان أبي أ صير على الناس على الوحدة لم يره أحد الا في المسجد او حضور جنازة اوعيادة مريض وكان يكره المشي في الاســواق)**[1]. واتە: عبدالله ی کوڕی ئیمام ئەحمدی حەنبەل (ڕەحمەتی الله لە خۆی و باوکی بێت) دەڵێ: باوکم لەهەموو کەس زیاتر ئارامگر بوو لەســـەر تەنیایی، وە هەرگیز هیچ کەس باوکمی نەدیووە بێ هودە و بێ کار چووبێت بۆ جێیەك، مەگەر یان لە مزگەوت بینراوە یان بەدوای جەنازەیەکەوە بووە یان لە

[1]- بڕوانە: صفة الصفوة (٢/١٢٤)

ســـەردانی نەخۆشـــێك بوو بێت، گەڕانی بازاڕی زۆر پێ ناخۆش بوو، بەکات کوشتنی زانیووە.

بەڵام بەشی زۆری خەڵك وەکو قوتابیە تەمبەڵەکانی قوتابخانە، کاتێك کە بیر دەکەنەوە لەناو تاقیکردنەوە دان، کەچی هەستیان نایەنێتە جووڵاندن، و کە بیر بکەنەوە لەناو تاقیکردنەوەیەکی سەخت و ناخۆش دانە و سەرئەنجامی هەمووومان بۆ ژێر گۆڕە و بیر بکەنەوە کە ئەم ژیانەی تێیدانە کاتیە و خزم و کەسە نزیکەکانی و هاوڕێ و ناسیاو و جیرانی مردن و لە پێش چاوانی وون بوون، بۆیە کەزانی ژیانێکی ئاوایە، دەست بکاتە کۆشش و کارو کردەوەی چاکە و خۆی بۆ ڕەزامەندی الله تعالی یەکلا بکاتەوە، بەداخەوە بەبێ خەمی بەرامبەری دادەنیشن، ئینجا کە ڕۆژی قیامەت هەڵدەستێ و بۆ گۆڕەپانی لێپرسینەوە دەبردرێن پەڕاوی کتێبی کردەوەی، توێشوو بەتاڵە و هیچ چاکەیان پێ نیە، لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاریان بکات، جا بەهۆی هەوڵنەدان و زەخیرە دانەنانی هەر تاکێکی ئەم کۆمەڵە بۆ تاقیکردنەوەی ژیانی دونیا وەکو کۆمەڵی قوتابیە تەمبەڵەکانە بۆ چەند هۆکار و بیرێکی هیچ و پووچی جیاواز دەگەڕێتەوە.

## وەڵامدانەوەی گومانی کەسی بێئاگا لە دواڕۆژ

ئەمانە بیانۆی کەسی بێئاگایە لە دواڕۆژ کە جێگای خۆیان لە دونیا خۆشکردووە بە گومانی پوچی خۆیان کە غەرقی خۆشی ژیان بوونە دەیان ئەوێ بە خەیاڵ پڵاوی خۆیان لە شوێن و مەکانێك بمێننەوە کە هی خۆیان نیە، با بزانین گومانە کانیان چین و چی هەیە بۆ بەرپەچدانەوەی گومانەکانیان:

- هەندێ کەس دەڵێ من هەرچەندی لەم دونیایە ڕابوێرم و کاری خراپە ئەنجام بدەم و پشت لە کاری چاکە بکەم و ئینجا ڕێبازی ئیسلام واز لێبێنێ لە پێناو حەز و ئارەزووی و شوێن ڕێبازێکی جاهیلی دەکەوێ و دەڵێ هەرچەند بێ تووێشو بچمە بەردەم الله تعال، ئەوە الله تعالی لێم دەبورێ و دووچاری ئازارم ناکات، چونکە الله بەزەیی هەیە لەسەر بەنی ئادەم، واتە: اللە_ رحیم_ە.

- هەندێ کەس هەیە تاقیکردنەوەی ژیانی دونیا و ئەنجامەکەی ئەوەندە بە گرنگ نایەتە بەرچاو بەشێوەیەکی چالاك بۆی بێتە مەیدان و هەوڵی کۆکردنەوەی چاکە بدا، کە لە پێناویدا واز لە ئارەزوو بازی و ڕابواردنە ناشەرعییەکانی دونیا بهێنێ، وە دەڵێ من با بە ئارەزووی خۆم لە ژیانی دونیا ڕابوێرم و خۆشی دونیا بنۆشم ئینجا هەرچی دەبێ با ببێت بە جەهەنەم.

- هەندێ کەس هەیە خۆشی و ڕابواردنەکانی دونیا بە ئەنجامی تاقیکردنەوەکە ناگۆڕێتەوە، چونکە لە خۆشی دونیا غەرق بووە و لە پارە و ژن و سەیارە و خانوو هیچی کەم نیە، حەرام دەخوات، تاوان دەکات، زوڵم دەکات، گوێی لێ نیە دەڵێ: با من لە دونیا بە ئارەزووی خۆم ڕابوێرم، لە قیامەتیش با بچمە دۆزەخ.

جا بیری ئەوانە لەگەڵ بیری دووەمی سەرەوە جیاوازە، چونکە ئەوانە بە پێچەوانەی ئەوان دەزانن تاقیکردنەوەکە چەند گرنگە و دەزانن ئەنجامەکەی چییە، بەڵام خۆشی دونیا هەلیخەڵەتاندوونە و وای لێکردووە بەو ئەنجامە نەیگۆڕنەوە.

- هەندێ کەس هەیە دەڵێ: من هەرچەندە نوێژ ناکەم و بەڕۆژوو نابم بەڵام پیاوێکی دڵ پاکم و هیچ گوناهم نەکردووە و ستەم لە کەس ناکەم و نانی حەرامم ناخۆم، ئەوەندەش بەسە بۆ دەرچوونم، وە الله بەس ئەوەندەی لەمن دەوێت.
- هەندێکیان بەهۆی ئەوەی پیاوێکی دیندار یان لە الله ترس باوکیان بووە، یاخود خزمێکیان لەو شێوەیە هەیە، دایان ناوە ئەمانە لە ڕۆژی قیامەت فریایان بکەون و شەفاعەتیان بۆ بکەن و ڕزگاریان بکەن.

- هەندێ کەس هەوڵ و چاکەکردنی کەسانی تر وەک برای یان خوشکی یان باوکی یان دایکی یان کوڕ و کچەکانی بەهی خۆی تێ دەگات و وادەزانێ کە هەوڵ و توێشووی ئەوان ئەویش لە دۆزەخ ڕزگار دەکات.
- هەندێ کەس نازانێت یان لە بیری دەکات بەهۆی دوور کەوتنەوەی لە ئیسلام و شوێن هەواو ئارەزوو کەوتنی تەواو غافل و بێئاگای دەکات کە تاقیکردنەوەی ژیانی دونیا یەکجارە و ئیتر کۆتایی دێت.
- هەندێ کەس ڕەنگە هەبن نیازی فێڵ کردنیان هەبێ لە الله تعالی (پەنا بەالله) وەک ئەو قوتابیانەی نیازی قۆپیەکردنیان هەبوو لەسەر مامۆستاکەیان.
- هەندێ کەس لە دونیا خاوەن دەسەڵاتە و پاسەوانی زۆری هەیە، دەست لە کاری چاک دەشواتەوە وا دەزانێ و ئەم دەسەڵات و پلە و پایە و پاسەوانانەی هەر وەکو ئێستای لە ڕۆژی قیامەتیش بە کەڵکی دێت و بەرگری لێ دەکەن و دەیپارێزن.٠
- هەندێ کەس لە دونیا پلە و پایەکی کۆمەڵایەتی بەرزی هەیە و خاوەن عەشیرەت و خێڵ و هۆزێکی گەورەیە، وا دەزانێت لە ڕۆژی قیامەتیش بەهەمان پلە و پایە بەرزی لە بەردەم الله تعالی ڕادەوەستێ لە گۆڕەپانی لێ پرسینەوە، وە ئەم عەشیرەت و هۆزەی گشتی لە پشتی ڕادەوەستن وەکو جاری جاران.

- هەندێ کەس خاوەنی پارە و سامانێکی زۆرە، وا دەزانێ ئەم سامانە لەوێشدا بە کەڵکی دێت و ڕزگاری دەکات.
- هەندێ کەس لەبەر ڕابواردن و خۆشی و هەڵاو بەزم و فریودەرەکانی دونیا لەبیر دەکات کە ژیان تاقیکردنەوەیە و ئێستا وا لەژێر تاقیکردنەوە و چاودێری الله تعالی و فریشتەی تایبەت ورد و درشتی کردەوەکانی تۆمار دەکەن.

جا ئەوەی بۆ ئێمەی موسڵمان گرنگە و زانینی پێویستە تا وەکو ئەو کۆمەڵەی خاوەنی ئەم فیکر و بیرە پووچەڵانەن واز لە هەوڵ و کۆشش و توێشوو و زەخیرە دانان نەهێنین، ئەوەیە کە تاقیکردنەوەی ژیانی دونیا زۆر جیاوازە لەگەڵ تاقیکردنەوەی قوتابخانە، ئەوەی ژیانی دونیا الله تعالی دایناوە کە خۆی مرۆڤی دروستکردووە، وە خۆی چاودێری دەکات و لێی دەپرسێتەوە و هەر خۆیشی بڕیاری دەرچوو یان دەرنەچوونی بۆ دەر دەکات، و تەنها یەک خولە و دەوری دووەمی نیە، ئەگەر لە دونیا بۆ الله ژیایت و شوێن ڕێبازی تەوحید کەتبووی ئەوە سەرکەوتن بە دەست دەهێنیت.

بەڵام (پاك و بێگەردی بۆ اللەی خاوەن عەرش) ئەوەی قوتابخانە مامۆستایەک سەرپەرشتی دەکات و نمرەکانی دادەنێ کە ئەویش مرۆڤە وەکو ئێمە، دەوری دووەمی هەیە و دەتوانی خولی دووەم وانە کەوتوەکان بدەیتەوە، ئەگەر لە خولی یەکەم دەرنەچووی.

ئێستاش با پێکەوە یەک بە یەک بیر و فیکرە جیا جیاکانی ئەو کۆمەڵە ڕوون بکەینەوە کە وازیان لە هەوڵدان بۆ دواڕۆژی نەبڕاوەی بەهەشت هێناوە:

* بەگوێرەی ئەوانەی دەڵێن الله تعالی بە بەزەییی (الرحیم و الرحمن) ە ڕاستە الله ڕەحیم و ڕەحمانە، بەڵام دەبێ ئەوەش بزانی کە الله سزاکەی زۆر توندە هەروەک خۆی زیاد لە جارێک و دووجار لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: ﴿ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾[1] واتە: دەبێ ئەوەش بزانن کە بە ڕاستی الله لە سزاداندا زۆر توندو سەختگیرە بۆ کەسێ لە بڕیارەکانی سەرپێچی بکات.

جا ئەگەر مامۆستایەکیش قوتابی تەمبەڵ بە ناهەق دەربچێنێ و بە ناهەق لەگەڵ تەلەبە زیرەکەکان کە خۆیان ماندوو کردووە یەک حسابیان بۆ بکات، ئەوا الله تعالی دادوەر ئەو بەندەیە لە سزادان دوور ناخاتەوە کە بەبێ کارو کردەوە و زەخیرەی چاک دەگەڕێتەوە لای، وە ئەو جۆرە کەسە وەکو ئەو کەسانە حیساب ناکات کە هەموو ژیانیان کردۆتە خەبات و زەخیرە دانان و تاقیکردنەوە لە پێناو ڕەزامەندی ئەودا،

﴿أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا لَّا يَسْتَوُۥنَ﴾[2] واتە: ئایا ئەو کەسەی ئیماندار بوو بێت وەك ئەو کەسەیە کە خراپەکار و تاوانبار بوو بێت؟ وەك یەك نین.

---

[1] - سورەتی المائدة ئایەتی: ٩٨

[2] - سورەتی السجده ئایەتی: ١٨

﴿أَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ جَنَّاتُ الْمَأْوَىٰ نُزُلًا بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[1]
واتە: بەڵکو ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، شوێنیان باخچەکانی بەهەشتە (کە بۆ هەمیشە جێگەی حەوانەوە و حەسانەوەیانە)، هەر لەوێ دادەبەزن، لە پاداشتی کارو کردەوەیەك کە دەیانکرد.
﴿وَأَمَّا الَّذِينَ فَسَقُوا فَمَأْوَاهُمُ النَّارُ كُلَّمَا أَرَادُوا أَن يَخْرُجُوا مِنْهَا أُعِيدُوا فِيهَا وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُوا عَذَابَ النَّارِ الَّذِي كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُونَ﴾[2]واتە: ئەوانەش تاوانبار یاخی بوون، شوێنیان ناو ئاگری دۆزەخە، هەر کاتێك ویستیان لێی دەرچن، دەگێڕدرێنەوە بۆ ناوی، پێیان دەوترێت: بچێژن سزای ئەو ئاگرەی کە بڕواتان پێی نەبوو.

چونکە ئەمە لەگەڵ دادوەری ناگونجێ، الله تعالی دادوەر چۆن دوو کەس بەیەک چاو سەیر دەکا یەکێکیان هەموو ژیانی لە زەخیرە دانان و هەوڵدان بۆ ڕۆژی دوایی تەرخان کردووە، ئەوەی تریشیان هەموو ژیانی لە ڕابواردن و ئیشی خراپ و دژایەتی ئیسلام بەسەر بردووە.

[1] - سورەتی السجدە ئایەتی: ١٩

[2] - سورەتی السجدە ئایەتی: ٢٠

﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَاطِلًا ذَٰلِكَ ظَنُّ الَّذِينَ كَفَرُوا فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِنَ النَّارِ* أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ﴾[1] واته: بێگومان ئێمه ئاسمان و زەوی و ئەم شتانەی له نێوانیاندا هەیه بەخۆڕایی بێ مەبەست نەخولقاندووە، ئەمه بۆچوونی بێ بڕواکانه، هاوار و هیلاک بۆ بێ بڕواکان لەو ئاگرەی دۆزەخ. نەخێر، ئەو باوەڕەیان هەڵەیه، بەڵکو ئایا ڕەوایه پاداشتی ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە و کاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە، وەک ئەوانه لێ بکەین که تۆوی خراپەیان چاندووە له زەویدا، یاخود ئایا ئەوانەی پارێزگار و لەخواترسن وەک خراپەکاران سەیریان بکەین؟!

﴿أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ * مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ * أَمْ لَكُمْ كِتَابٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ * إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ * أَمْ لَكُمْ أَيْمَانٌ عَلَيْنَا بَالِغَةٌ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ إِنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ * سَلْهُمْ أَيُّهُمْ بِذَٰلِكَ﴾[2] واته: ئایا ئێمه موسڵمانان وەکو بەدکاران لێ ئەکەین! ئەوە چیتانه چۆن بڕیارێک ئەدەن! یا خۆ نامەیەکی (ئاسمانی) تان بەدەستەوەیه ئەمەی تیا ئەخوێننەوە وە لەم نامەیه ڕێتان بۆ درابێ چیتان بوێ ئەوە هەڵبژێرن بۆ خۆتان! یان پەیمانی بەهێزتان لەسەر ئێمه هەیه و تا ڕۆژی دوایی ڕەوا بێ که هەرچی ئێوە بتانەوێت بتاندرێتێ! لێیان بپرسه کامیان دەستەبەرو زامنی ئەم قسەیەن!

[1] - سورەتی ص ئایەتی: ص٢٧-٢٨

[2] -سورەتی القلم ئایەتی: ٣٥-٤٠

* ئەوانەی تاقیکردنەوەی ژیانی دونیا بەگرنگ نازانن و حسابی بۆ ناکەن بێ ڕادە بەهەڵەدا چوونە، چونکە هێشتا ئەگەر قوتابیە تەمبەڵەکانی تاقیکردنەوەی قوتابخانەیان بە کەم بێتە بەرچاو ڕێیەکی تێ دەچێت، لەوانەیە بەهۆی تاقیکردنەوەی تر پڕی بکەنەوە یان بڵێن ساڵێکی ترمان لە پێش ماوە، وە لەوانەیە تاقیکردنەوەکە یاخود هەر قوتابخانە بەگشتی کارێکی گەورەی نەبێت بەسەر چارەنووسیان، بەڵام تاقیکردنەوەی ژیانی دونیا یەکە و یەک چارەنووسی ڕۆژی دوایی مرۆڤی لەسەر بەندە، کە بەهەشت و دۆزەخە، ئەگەر تیایدا سەرکەوێت ئیتر لە ژیانی دۆزەخ ڕزگاری دەبێت و هەتا هەتایە لە بەهەشت دەژی پاش ئەوەی دەکەوێتە ناو ڕەزامەندی الله، خۆ گەر دەرنەچوو بێت هەتا هەتایە ژیانی لەناو ئاگری سەخت و بە ئێشی دۆزەخ بەسەر دەبات، (پەنا بەالله) جا ئایا ئەم تاقیکردنەوەی ژیانی دونیا بەم شێوەیە گرنگ نییە؟! ﴿**كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا مَتَاعُ الْغُرُورِ**﴾[١] واتە: هەموو کەسێک دەبێت بمرێت و مردن بچێژێت، تەنها لە ڕۆژی قیامەتدا کرێ و پاداشتان بەتەواوی پێ دەدرێت (دەرئەنجامی کردەوە کانتان دێتەوە ڕێتان) ئەوسا ئەوەی دوور خرایەوە لە ئاگری دۆزەخ و خرایە بەهەشتەوە، ئەوە بەڕاستی سەرفراز بووە، ژیانی دونیاش بێجگە لەوەی کە ڕابواردنێکی خەڵەتێنەرە شتێکی تر نیە.

---

[١] - سورەتی ال عمران ئایەتی: ١٨٥

* بەگوێرەی ئەوانەش کەوا دەزانن ئەنجامی تاقیکردنەوەی ژیانی دونیای لەسەر دانانێن و خۆیانی بۆ ماندوو ناکەن، ئەوانە بۆیە وا دەکەن چونکە ئەنجامەکەی بەدوور تێدەگەن دەڵێن با جارێ ڕابوێرین و کێ دەڵێ قیامەت دێ لەسەر ئەو پەندە دەڕۆن کە دەڵێ: چۆلەکەیەکی ناو دەست باشترە لە دەی سەر دارەکە! لەبەر ئەوە ژیانی دونیایان هەڵبژاردووە کە ئێستا لە ناو دەستیانە، ﴿إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُ بَعِيدًا﴾[1] بەڕاستی ئەو بێ باوەڕانە، قیامەت بەدوور دەبینن، بەدووری دەزانن.

لە پارە، ژن، سەیارە، خانووی بەرز، بەڵام ئێمە لێیان دەپرسین: ئایا ئەو خۆشی و ڕابواردنە کاتیەی دونیا باشترە، یان خۆشی و نازو نیعمەتی بەهەشت؟!!

* بە گوێرەی ئەو کۆمەڵەی هیچ کارو کردەوە ناکەن و زەخیرە دانانێین بەوەی کە دەڵێن: دڵمان پاکە، ئەوانەش لە نێو جەهل و نەزانین غەرق بوونە و بە هەڵە داچوونە، چونکە ئەگەر بچین سەیری قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) بکەن بۆمان دەردەکەوێ کە بەبێ توێشو و زەخیرە و کارو کردەوەی چاک، دەرچوون لەم تاقیکردنەوەیە و ڕزگاربوون لە ئاگری دۆزەخ شتێکی مەحاڵە پیاو دەستی بکەوێ، وە لە هەموو جێگەیەکی قورئان کە الله تعالی باسی ئیمانی کردبێ کار و کردەوەی لەگەڵ باسکردووە، بەبێ کار و کردەوەی چاك بە گوێرەی شەرع بە دەست هێنانی بەهەشت و ڕزگار بوون لە

[1] - سورەتی المعارج ئایەتی: ٦

ئاگری دۆزەخ بوونی نیە، یان کردەوەی چاکە بەڕێ دەکەی و بە هەشت بەدەست دەهێنی، یان بێغەم پاڵ ئەدەیەوە و خۆت ماندوو ناکەی بە دوای ڕابواردنی نەفست ئەکەویت و سەرنجام ئاگر دەبێتە شوێنت.

﴿وَالْعَصْرِ * إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ * إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾[١] واتە: سوێند بە ڕۆژگار مرۆڤ لە زەرەرمەندی دایە مەگەر ئەوانە نەبن کە بڕوایان هێناوە و کردەوەی چاکیان کردووە و یەکتریش لەسەر هەق و ئارامگری هاندەدەن.

ئەی ئایا ئەوانە چۆن دەیانەوێ بێ کارو کردەوە لەم تاقیکردنەوە گەورەیە دەربچن؟!

* ئەو کەسەی کە باوکێکی یان خزمێکی دیندار و لە اللەترسی هەیە و دەیەوێ بەهۆی ئەوەوە اللە تعالی لەویش خۆش ببێ و لە ئاگرەکە رزگار بێ، ئەوەشیان هەر بەهەڵە چووە، ئەگەر قوتابیش ئەم جۆرە بیرەی هەبێ هێشتا ڕێیەکی تێ دەچێ، چونکە بەڕاستی لە دونیادا زۆرجار واستە و واستەکاری دەخوات! بەڵام لە ڕۆژی قیامەت واستەو واستەکاری بوونی نییە، لەوێ نە کەس ئاگای لە کەس دەمێنێ نەکەس بە کەڵکی کەس دێ و نەکەسیش گوناهی کەس بەخۆیەوە هەڵدەگرێ.

[١] - سورەتی العصر ئایەتی:١-٣

﴿أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ * وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ * وَأَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَىٰ * ثُمَّ يُجْزَاهُ الْجَزَاءَ الْأَوْفَىٰ﴾[1] واتە: کە هیچ کەس باری گوناهی یەکێکی تر هەڵناگرێ و مرۆڤ هەرچی بە هەوڵی خۆی پەیدای نەکات بۆی نابێ، وە بێگومان پاداشتی کردەوەی خۆی نیشان ئەدرێ، لە ڕۆژئ دوایش جەزایەکی تێر و تەواوی دەداتەوە (واتە: پاداشتی چاکەکاران چەندانە ئەبێتەوە سزای خراپەکارانیش بەقەد خراپەکەیەتی و بۆی زیاد ناکرێ).

﴿يُبَصَّرُونَهُمْ يَوَدُّ الْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِي مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍ بِبَنِيهِ * وَصَاحِبَتِهِ وَأَخِيهِ * وَفَصِيلَتِهِ الَّتِي تُؤْوِيهِ * وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنجِيهِ * كَلَّا إِنَّهَا لَظَىٰ﴾[2] واتە: بێبڕواکان کەس و کاری یەکتریان پێ نیشان ئەدرێتەوە و کەس قسەیێ ناکات لەبەر سەختی ئەم ڕۆژە، بێ بڕوای تاوانبار لەم ڕۆژەدا حەز دەکات کوڕ و خێزان و برا و هۆزەکەی(کە پەنای دەدات) هەروەها هەموو کەسێکی سەر زەمین بکات فدیە تا ئەو خۆی ڕزگاری ببێ، نەخێر (قوربانی وەرناگیرێ) بەڕاستی ئاگرت دۆزەخ بە بڵێسەیە.

---

[1] - سورەتی نجم ئایەتی: ٣٨-٤١

[2] - سورەتی المعارج ئایەتی:١١-١٥

﴿فَإِذَا جَاءَتِ الصَّاخَّةُ * يَوْمَ يَفِرُّ الْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ * وَأُمِّهِ وَأَبِيهِ * وَصَاحِبَتِهِ وَبَنِيهِ * لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ﴾[1] واتە: کاتێ شاخەو شریخەی ڕۆژی دوایی هات، لەو ڕۆژەدا مرۆڤ لە برا و دایک و باوک و کوڕەکانی خۆی ڕادەکات، لەو ڕۆژەدا هەموو یەکێ لەوان لە حاڵی ناخۆش و سەختی خۆی خەریکە و لە حاڵی کەسانی تر دەستە بەرداری دەکات.

﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَيْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ﴾[2] واتە: هیچ کەسێ باری گوناهی یەکێکی تر هەڵناگرێ، وە ئەگەر کەسێک بانگی گوناهبارێک بکات تا گوناهی بۆ هەڵگرێ بڕێکیش چییە بۆی هەڵناگرێ ئەگەر چی خزمیش بێ.

﴿مَّنِ اهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾[3] واتە: ئەوەی هیدایەتی بوو پاداشتی هیدایەت بوونەکەی هەر بۆ خۆیەتی، وە ئەوەی گومڕا بوو ئەوە سزاکەی هەر لەسەر خۆیەتی، وە کەس باری گوناهی یەکێکی تر هەڵناگرێ وە ئێمە سزادەر نین تا پێغەمبەرێکیان بۆ دەنێرین.

---

[1] - سورەتی عبس ئایەتی:٣٣-٣٧

[2] - سورەتی فاطر ئایەتی: ١٨

[3] - سورەتی الإسراء ئایەتی: ١٥

* ئەو کەسەی بەتەمای ئەوەیە بەهۆی کاروکردەوە باشەکانی برا و خوشک و خزمەکانیان ڕزگار دەبن، ئەوانەش بەهەڵە چوونە، چونکە ئەم تاقیکردنەوەیە وەکو قوتابخانە نییە، قوتابیە زیرەکەکان ئەوانەی خۆیان بۆ ئامادە کردووە لە ژووری تاقیکردنەوە، یارمەتی قوتابیە تەمبەڵەکان بدەن و وەڵامەکەیان پێ بڵێن، ئەوە ئەگەر لە قوتابخانەش ڕوو بدات لە تاقیکردنەوەی الله تعالی ڕوو نادات. لەم تاقیکردنەوە مەزنەدا ئەوەی توویشوی خۆی لە چاکە و کردەوەی باش پێ نەبێ بە زەخیرەی برا و خوشک و خزم و برادەرەکانی ڕزگاری نابێت.

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ وَاخْشَوْا يَوْمًا لَّا يَجْزِي وَالِدٌ عَن وَلَدِهِ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِ شَيْئًا إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِاللَّهِ الْغَرُورُ﴾[١] واتە: ئەی خەڵکینە لە پەروەردگارتان بترسێن، لەو ڕۆژەش بترسن کە نەباوک بۆ کوڕ و نە کوڕیش بۆ باوک نابنە جەزا وەرگری یەکتری، بەڵێنی الله ڕاستە، جا ژیانی دونیا فریوتان نەدا، وە شەیتانیش فریوتان نەدا.

[١] - سورەتی لقمان ئایەتی: ٣٣

* ئەوانەش کە نازانن یان لەبیریان کردووە تاقیکردنەوەی ژیانی دونیا یەک جارە، ئەوانەش با تەماشای ئەو نەوانەی پێشومان بکەن کە هاتنە دونیا جێیان هێشتین و تاقیکردنەوەی خۆیان کرد و ڕۆیشتن بزانە لە خۆت بپرسە کەسیان جارێکی تر گەڕانەوە سەر دونیا بێگومان نەخێر، ئەوەش بزانە چونکە تاقیکردنەوەی ژیانی دونیا یەکجارە وەکو تاقیکردنەوەی قوتابخانە نییە دەوری دووەمی هەبێ، بەڵکو یەک جارە کە تەواو دەبێ ئیتر ناگەڕێتەوە بۆ دونیا، بۆیە کە زانیمان یەکجارە دەبێ ژیر و ئاقڵ بین و ڕێگای حەق بگرینە بەر، چونکە الله تعالی ئاگاداری کردووینەوە، لە گشت چاکە و خراپەیەک، پێغەمبەری بۆ ناردووین ﴿ﷺ﴾، یاسا و ڕێساو بەرنامەی بۆ داناوین کە ئیسلامە، تەمەنی پێداوین بۆ ئەوەی ماوەیەک لە دونیا بژین، بۆ ئەوەی لە دواڕۆژ برو و بیانۆمان نەبێت، بەوەی کە لە دونیا لە هەموو خۆشیەک و هەموو نیعمەتێک بێبەش بووین، بە پێچەوانەوە، تەواوی شتەکانی دونیا لە پارە، جوانی، هێز، هاوسەرگیری، تەواوی بەخششەکانمان بەسەر ڕژابوو، کەچی بیرمان لە خۆمان نەدەکردەوە کە مانەوا لە دونیا کاتیە، تەمەنێکی زۆر ژیایین لە بێ فەرمانی و کوفر و نیفاق و دژایەتی ئیسلام، بۆیە لە قیامەت سەرشۆڕ و خەجاڵەتین، هەروەکو الله عزوجل بیری مرۆڤەکان دەهێنێتەوە، و باسی پەشیمانی و گریان و ناڵەی ئەهلی دۆزەخ دەکات، کە داوا دەکەن بگەڕێنەوە بۆ دونیا تاکو چاکە بکەن و ڕێگای ئیسلام بگرنە بەر:

﴿وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ فَذُوقُوا فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ﴾ [١].

واتە: ئەوانە گریەو زاری و هاوارو قیژەو ناڵەیان لەناو دۆزەخدا لێ بەرز دەبێتەوەو بەکەساسیەوە دەڵێن پەروەردگارا: دەرمان بهێنەو ڕزگارمان بکە لەم حاڵە، بەڵێن بێت کارو کردەوەی چاك ئەنجام بدەین، نەك ئەوەی کە جاران دەمانکرد، لە وەڵامیاندا الله عزوجل دەفەرمووێت: ئایا ئەوەندە تەمەنمان پێ نەبەخشین؟ ئەوەی بیەوێت بیرێك بکاتەوە تیایدا بیربکاتەوە؟!بێدارکەرەوەشتان بۆ هات، (دیارە هەموویان خەجاڵەت و سەرشۆڕدەبن و قسەیان نامێنێت)، بۆیە پێیان دەوترێت: کەواتە دە بچێژن سزای دۆزەخ، چونکە ستەمکاران هیچ پشتیوانێکیان نیە.

بۆیە تاکو لە ژیانین و فرسەتە با تەوبە بکەین و بگەڕێینەوە بۆ سەر ڕاستە شەقامی ئیسلام، و ئەو تەمەنەی ماومانە پەیان و بەڵێن بدەین لەگەڵ الله عزوجل کە تاکۆتا هەناسەی ژیان بەندەی بین و ڕێبواری ڕێی ئیسلام بین، تا بەهەشت ببێتە شوێنی مانەوەی هەمیشەیان.

[١] - سورەتی فاطر ئایەتی (٣٧).

* ئەو کەسانەش کە لەبەر ڕابواردن و خۆشی ڕۆژی دوایی لە بیر دەکەن خۆیان بۆ ئامادە بکەن، ئەوانە دەرناچن و چارەنووسیان بە ئاگری گەرمی دۆزەخ دەگات، وە الله تعالی لە دەیەها جێگەی قورئانی پیرۆزدا ئێمەی ئاگادار کردۆتەوە کەخۆشی و ڕابواردنی ئەم دونیایە ڕۆژی قیامەتمان لە بیر نەباتەوە، بەڵام بەداخەوە ئەوانە گوێ نادەنە ئامۆژگاریەکانی الله تعالی، بۆیە ڕێگای ئیسلام لە پێناو ئارەزووی نەفسییان دەکەنە قوربانی و مردن و گەڕانەوە بۆ قیامەت لە بیر دەکەن، هەر بۆیە ئەو تاوانبار و کافرانە لە ڕۆژی قیامەتیش کە دەبردرێن بۆ دۆزەخ ئەوە لە لایەن رەحم و میهرەبانی الله تعالی لەناو ئاگر لەبیر دەکرێن:

﴿ الَّذِينَ اتَّخَذُوا دِينَهُمْ لَهْوًا وَلَعِبًا وَغَرَّتْهُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا فَالْيَوْمَ نَنسَاهُمْ كَمَا نَسُوا لِقَاءَ يَوْمِهِمْ هَٰذَا وَمَا كَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ﴾[١]

واتە: ئەو کافرانەی کە دینی الله تعالی یان بە گاڵتە و یاری دەزانی و ژیانی دونیا فریوی پێ خواردبوون، بۆیە ئێمەش ئەمڕۆ لە یادیان ئەکەین هەر وەک چۆن ئەوان دیداری ئەمڕۆژەیان لە یاد کرد بوو نکۆڵیان لە ئایەتەکانی ئێمە دەکرد.

---

[١] - سورەتی الأعراف ئایەتی: ٥٠- ٥١

* ئەوانەش کە وەکو قوتابیانی قوتابخانە بە تەمای ئەوەن بە خەیالی پوچی خۆیان فێڵ لە الله تعالی بکەن، دەڵێین: ئەگەر مامۆستای قوتابخانەش فێڵی لێ بکرێ الله تعالی لێی ناکرێ، چونکە:

أ- لە دونیا هیچ کارێکت یان قسەیەکت نیە بیکەی و بتوانی لە الله تعالی بیشاریەوە: ﴿وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ، كِرَامًا كَاتِبِينَ، يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ﴾[1] واتە: بێ گومان چەند ئاگادارێکتان بەسەرەوەیە کە بەڕێزن و نووسەری کردەوەکانتانن، هەرچی بکەن دەیزانن.

﴿مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾[2] واتە: هەر ووتەیەک کە بدرکێنێ چاودێرێکی ئامادە بووی لە لا دایە.

ب- لە ڕۆژی قیامەتیش ناتوانی ئەو کار و کردەوانەی کردووتە لەسەر خۆتی لا بدەی و خۆتی لێ بێبەری بکەی، چونکە هەر ئەندامەکانی جەستەی خۆت شاهیدیت لەسەر ئەدەن: ﴿ يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[3] واتە: لە ڕۆژێکدا کە زمان و دەست و قاچیان لێیان دەبێتە شایەتێکی گۆیا، لە بەرامبەر ئەو کردەوانە کە ئەنجامیان دەدا.

---

[1] - سورەتی الأنفطار ئایەتی: ١٠-١٢.

[2] - سورەتی ق ئایەتی: ١٨.

[3]- سورەتی النور ئایەتی: ٢٤

ج- وه مرۆڤەکان بەر پرسیارن لە قیامەت، چونکە الله تعالی دروستی کردوونە و هەموو شتێکی بۆ موسەخەر و فەراهەم هێناوە لە پێناو ئەوەی بە تاك و تەنها بیپەرستن، هەموو خۆشیەکانی دونیا لە گشت ناز و نیعمەتەکانی پێ بەخشیوین تاکو بە خۆشی بژین و الله تعالی لە بیر نەکەن، و بە تەنها بەندەی ئەو بین، بۆیە لە پاداشتی کردەوە خراپەکانمان الله تعالی بەر پرسیار نیە، بڵێیت بۆچی چاوت پێ نەداین پێ ببین، یان کاتەکان بەس ڕۆژ بوو شەو و کاتی پشووت دروست نەکردبوو، یا برو بیانۆی تر، بۆیە الله تعالی دەفەرمووێت: ﴿**لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ**﴾[1] واتە: پرسیار ناکرێت لەوەی کە الله دەیکات و پاداشتی بەندەکان ئەداتەوە، لە کاتێکدا ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێت و لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێ.

ئەوکاتی لە دوارۆژ الله تعالی دەفەرمووێ: ئەی گوێم پێنەدای گوێ بیستی بانگخوازانی ڕێگای ئیسلام بی، بەڵام تۆ گوێت قوفل کردبوو لەئاست وەرگرتنی حەق و ڕاستی، ئەی بەندەی خۆم چاوم پێت نەبەخشی تۆ بۆ خراپە و سەیرکردنی حەرام بەکارت دەهێنا، لەش ساغیم پێت نەبەخشی کەچی فلان چاوێکی کوێر بوو و دەستێکی ناتەواو بوو بەڵام هەمووکات بەندەیەکی دڵسۆز بوو لەڕێگای مزگەوت و هاوکاری موسڵمانان بوو.

کەواتە ئەی چۆن فێڵ لە الله تعالی دەکەی؟!

[1] - سورەتی الانبیاء ئایەتی: (٢٣)

* ئەو کەسەش وا دەزانێ دەسەڵات و پاسەوانەکانی وەکو ئێستا لە ڕۆژی قیامەتیش بەکەڵکی دێنەوە، ئەوەش بەهەڵە چووە ئەگەر ڕاست دەکات با ئەو دەسەڵات و پاسەوانانەی لە کاتی ڕۆح کێشانی بیپارێزن لە مەلائیکەتی گیان کێشان (ملك الموت) کاتێ دەچێتە ژووری، بەڵام ئەوانە ئەو کاتە باش بۆیان دەردەکەوێ کە دەسەڵات و پاسەوان هیچ نین، ئەو کاتەی الله تعالى دادگاییان دەکات و دەڵێن:

﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِشِمَالِهِ فَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَابِيَهْ، وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ، يَا لَيْتَهَا كَانَتِ الْقَاضِيَةَ، مَا أَغْنَى عَنِّي مَالِيَهْ﴾[1]

واتە: وە ئەو کەسەی کارنامەکەی درا دەستی چەپی دەڵێ خۆزیا کار نامەکەم هەر پێ نەدرابا، نەمزانیبا چییە (سەرەنجامی) لێ پرسینەوەم، خۆزیا مردنەکەی دونیام یەکجارەکی بوایە و زیندوو نەبومایەوە تا ڕزگار بومایە، خۆ ماڵەکەم هیچ سوودێکی پێ نەدام و دەسەڵاتەکەم لە دەست چوو!

وە لەوانە دەپرسین ئایا الله تعالى لە دەسەڵات و پاسەوانی ئێوە دەترسێ؟!

حاڵی ئەو کەسانەی کە لەژیانی دونیا تەنها ڕابواردن و خۆشی و گاڵتەکردن بە ئیسلام و موسڵمانان بوو، کە سەرتاپای ژیانیان بێ فەرمانیکردنی الله تعالى بوو، خۆش دونیا غافڵی کردبوون وایان دەزانی کەوا نامرن ئەوجا لەو کاتەی فریشتەی گیان کێشان بۆ هەریەك دێت.

[1] - سورەتی الحاقة ئایەتی: ( ٢٥-٢٨)

﴿كَلَّا إِذَا بَلَغَتِ التَّرَاقِيَ﴾[1]. واتە: نەخێـر ئەو خەڵکە هەروا ژیانیان بەردەوام نابێت بەڵکو کاتێك دێت کە ڕۆحی یەك بەیەکیان دەگاتە گەرووی.

بەڵێ براو خوشکانم خۆ هەروا بەخۆشی لەم دونیایە نامێنینەوە بۆ ڕابواردن و هەلاو بەزم، مردن سەرەنجامی هەموومانە.

﴿وَقِيلَ مَنْ رَاقٍ﴾[2]. واتە: ئەوسا دەگوترێت: ئایا پزیشکێك، نوشتەیەك نزایەك دەستناکەوێت تا چاکی بکاتەوە.

بەڵێ وا تەرمی بێگیان لەوێ کەوتووە دەبا کەسێك یان پاسەوان و هێزێکی هەبێ چارەی بکات و بیگەڕێنێتەوە بۆ ژیان! کەچی کاتێك لە ژیان بوو بە پاسەوان و هێزەکەی پشتی توند بوو.

﴿وَظَنَّ أَنَّهُ الْفِرَاقُ﴾[3]. واتە: بەڵام لەو کاتەدا، ئەو کەسەی لەسەرە مەرگدایە دڵنیایە کە ئیتـر هیچ شتێك فریای ناکەوێت و کاتی ماڵئاواییە.

بێگومان بێ دەسەڵاتە لەوکاتی دەزانی گەر دونیا هەموو لە پشتی بن و سوپا و هێزی بن سوودی نیە تازە !

﴿وَالْتَفَّتِ السَّاقُ بِالسَّاقِ﴾[4]. واتە: ئیتر قاچ و لوولاق بەیەکدا دەئاڵێن بەهۆی سەختـی ئەو ڕۆژە.

---

[1]- سورەتی القیامة ئایەتی: {٢٦}

[2]- سورەتی الیقامة ئایەتی: {٢٧}

[3]- سورەتی القیامة ئایەتی: {٢٨}

[4] - سورەتی القیامة ئایەتی: {٢٩}

نەخێر بەداخەوە لەو ساتەی مەرگ دەبێتە میوانی هەرکەسێك ئەوا هیچ واستەیەك و کەس و پاسەوان و هیزێك ناخوات تا ڕزگاری بێت! وە هیچ دەرمانێکت دە ست ناکەوێت تا چارەسەری بکات و بیگەڕێنێتەوە بۆ دونیا!

* ئەو کەسانەی وا گومان دەبەن کە پلە و پایەی کۆمەڵایەتی لە دونیا فریای قوتابی بکەوێ و بە ناهەق دەری بچێنێ، ئەوا لە لای الله تعالی مرۆڤ بەهۆی قەوم و خێڵ و هۆزەکەی رزگاری نابێت.

﴿لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ﴾[1] واتە: هەرگیز نە خزمانتان و نە منداڵانتان سوودتان پێناگەیەنن و فریاتان ناکەون، لە رۆژی قیامەتدا، کە ئێوە لە بەر ئەوان دۆستایەتیان دەکەن لە رۆژی قیامەتدا الله لێکتان جیا ئەکاتەوە(بڕوادارو بێ بڕوا)هەر کەسە ئەنێرێ بۆ جێگای شیاو بەخۆی ئەگەرچی کەس و کاریشتان بن.

*بەگوێرەی ئەو کەسانەش کە خاوەنی پارە و سامانن، ئەوانەش بەهەڵە داچوونە ئەگەر وابزانن ئەو پارە و سامانە ڕزگاریان دەکات، بەگوێرەی قوتابی بتوانێ بەهۆی پارە و بەرتیل خۆی دەربچێنێ، بەڵام لەلای الله تعالی پارە و ماڵ سوودی نیە. ﴿لِلَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمُ الْحُسْنَىٰ وَالَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُوا لَهُ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُ مَعَهُ لَافْتَدَوْا بِهِ أُولَٰئِكَ لَهُمْ سُوءُ الْحِسَابِ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمِهَادُ﴾[2]. واتە: ئەوانەی بەدەم بانگەوازی الله چوونە

---

[1] - سورەتی الممتحنة ئایەتی: {٣} .

[2] - سورەتی الرعد ئایەتی: (١٨).

(فەرمانبەری فەرمانی اللەیان کردووە) بەختیاری و چوونە بەهەشتیان بۆ هەیە،وە ئەوانەی وەڵامی بانگی اللەیان نەدایەوە ئەگەر هەموو ئەو شتانەی لە زەوی و چەندەهای تریشیان هەبێ گشتی دەکەنە قوربانی و دەیبەخشن (تاکو لە سزای ئەم ڕۆژە قوتار بن بەڵام لێیان وەرناگیرێ) ئەوانە لێ پرسینەوەیەکی سەختیان بۆ هەیە جێ نشینیان دۆزەخە کە بەڕاستی شوێنێکی بەد و ناهەموارە.
﴿وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ ظَلَمَتْ مَا فِي الْأَرْضِ لَافْتَدَتْ بِهِ ۗ وَأَسَرُّوا النَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا الْعَذَابَ ۖ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ ۚ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾[١] واتە: ئەگەر هەموو ئەو شتانەی لە زەوی دا هەن هی کەسێکی موشریک بێ، هەمووی دەکاتە قوربانی (تا ڕزگاری بێ)وە زۆر پەشیمانی ئەخەنە دڵیانەوە لەو کاتەی سزا و ئازار دەبینن، وە بە دادگەرانە حوکمیان لە نێودا کراوە و زوڵمیان لێ ناکرێت.
﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَمَاتُوا وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يُقْبَلَ مِنْ أَحَدِهِم مِّلْءُ الْأَرْضِ ذَهَبًا وَلَوِ افْتَدَىٰ بِهِ ۗ أُولَٰئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ وَمَا لَهُم مِّن نَّاصِرِينَ﴾[٢] واتە: ئەوانەی کوفریان کرد و بە کافرێتی مردن، هەر یەکێکیان ئەگەر بە ئەندازەی زەویش زێڕ بەخشێ و بیکاتە قوربانی بۆ ڕزگار بوونی ئەوا لێی وەرناگیرێت، ئەوانە سزا و ئازارێکی بەئێشیان بۆ هەیە هیچ سەرخەر و پشتیوانیان بۆ نیە ڕزگاریان بکات.
بەداخەوە گشت مرۆڤەکان عەقلیان هەیە بەڵام زۆرینە بەکاری ناهێنن، زۆر جار سەیری دەوروبەر دەکەی نازانی شیوەن بگێڕی یان دڵخۆش بیت.

---

[١] - سورەتی یونس ئایەتی: (٥٤).
[٢] - سورەتی ال عمران ئایەتی: ٩١.

سەیریان دەکەی و بیریان لێ دەکەیەوە سەرگەردانی دونیایەکی کاتی و فانی لە کاتێکدا وادەزانن نامرن! ئەو پیرە مێردە و بەساڵاچوانە دەبینی ئەوەندەی ئەوان سورن لەسەر پارە کۆکردنەوە گەنجێک ئەوەندە سور نیە، دەبینی خەریکی شتی بێ مانان! کۆمەڵێک گەنجی ئالودە بوو بە دۆمینەو نێرگەلەو بازاڕەکان کە سەیریان دەکەی و سەیری خۆت دەکەی دەڵێی بەهەشت بۆ من نەبێت بۆ کێیە! کاتێکیش سەیری هاوەڵان و پیاوچاکان دەکەی لەو ماندبون و عیبادەتەی کردویانە و تەمبەلی خۆشمان کە باڵی بەسەر لاشەی کێشاوین و هێزی لێ بڕیوین بێ ماندو بوون دەڵێی بەهەشت بەچاوی خۆم نابینم!!

مرۆڤەکان هاتونەتە دونیا بۆ ئەوەی عیبادەتی الله بەتەنها بکەن لەو سەردەمەی پڕ فتنەیە دەبێ زۆر ئاگاداری خۆمان بین.

بزانین دۆستایەتی کێ دەکەین، دین لە کێ وەردەگرین؟!

ئاخر ئەوەندە ئاسان نیە مرۆڤ ئێستا موسلمان بێ دوای چارەگە سەعاتێک ببێتە کافر ئێستا ئێمە لەو سەردەمەین.

لەبەر ئەوە زۆر پێویستە ڕوو لە اللەبکەین ڕۆنەچین لە خۆشیەکانی دونیا، ڕوو لە قیامەت بکەین، ئاگاداری ئیمانی خۆمان بین، یارب عاقیبەت خێربین...

## الله پەرستی پیاوچاکان و ترسیان لە ژیانی دوای مردن!.

بۆ ئەوەی جیاوازی خۆمان و پێشینە چاکەکان لە ڕووی بۆ الله ژیان و خۆماندو کردن و تێکۆشانیان بزانین پێم باش بوو نموونەی ئەو کەلە پیاوە جوامێرانە بێنینەوە تاکو بزانین ئاسمان و زەوی جیاوازین ئەگەر سەیری ژیانی پیاو چاك و سەلەفی سالح بکەین رەحمەتی الله تعالی یان لێ بێت کە چەندە لە الله ترس بوونە و خەمی یەکەمیان قیامەت و ڕەزامەندی الله تعالی بووە، هەوڵی خۆماندوکردنیان داوە لە تاقیکردەوەی ژیانی دونیا، بۆ ئەوەی بەهەشت بەدەست بێنن.

بۆیە رەحمەتان لێ بێت با ئێمەش چاویان لێ بکەین بۆ ئەوەی ڕزگارمان بێت لە ئاگری دۆزەخ (پەنا ئەگرین بە الله تعالی لە ئاگری دۆزەخ).

ڕەیاح ئەلقەیسی گوتی: ئەی ئەبو ئیسحاق تۆ دەڵێی چی ئەگەر بە یەکێك لەم مردووانە بگوترێت ئاواتی چی دەخوازیت.؟ !

دەبێت بڵێ چی مردووەکە؟!

منیش گوتم: سوێند بێت بە الله تەنها ئاواتی گەڕانەوە بۆ دونیا دەخوازێت، تا عیبادەتی الله تعالی بکات و کردەوەی چاکە بکات، ڕەیاح ئەلقەیسی گوتی: ئەی ئەبو ئیسحاق ئێمە ئێستا وا لە ژیانی دونیا داین دەی با عیبادەتی الله تعالی بکەین و کردەوەی چاکە بکەین، پاشان رياح القيسى هەستاو خۆی

گورج کردوو زیاتر عیبادەتی الله تعالی دەکرد و خۆی زۆر ماندوو دەکرد، ئەوەندەی پێنەچوو مرد (ڕەحمەتی الله پەروەردگاری لێ بێت)[1]

ئەی بەندەی الله کاتێك سەردانی گۆڕستانت کرد بڕۆ سەر گۆڕێکی هەڵکەندراو، بیرێك لەو شوێنە تەنگ و تەسکە بکەوە، وا بێنە پێش چاوی خۆت ئێستا تۆی تێدایت، دەرگات لەسەر داخراوە، خۆڵت بەسەردا کراوە، ماڵ و منداڵ و کەس و کارت بە جێیان هێشتویت، گۆڕ بە تەنگ و تاریکییەکەی دەوری داویت، هیچ شتێك نابینیت تەنها کردەوەکانت نەبێت، لەو سات و کاتە ناخۆش و ناڕەحەتەدا ئاواتی چی دەخوازیت.؟!

ئایا تخوا ئاواتی گەڕانەوە ناخوازیت بۆ دونیا تا کردەوەی چاکە بکەیت، تا یەك ڕکات نوێژ بکەیت، یەك جار بڵێیت: سبحان الله، تا یادی الله بکەیت ئەگەر تەنها یەك جاریش بێت، ئێستا تۆ وا لەسەر زەویت زیندوو و لەش ساغیت، دەی کردەوەی چاکە بکە، و توند و گورج و گۆڵبە بۆ تاقیکردنەوەی ژیانی دونیا پێش ئەوەی پەنجەی پەشیمانی بگەزیت، پێش ئەوەی بچیتە ڕیزی مردووەکان و لەبیر بکرێیت، ئاواتە خوازیت بەڵام وەڵام نادرێیتەوە تا کو بگەڕێیتەوە سەر زەوی.

کاتێك خرایتە ناو گۆڕەوە خۆ جارێکی تر بۆ ژیانی دونیات ناگەڕێیتەوە، ناتوانی کردەوە چاکەکانت زیاد بکەیت، مەگەر کارێکی خێری وات کردبێت ببێتە خێری نەبڕاوە (الصدقه الجاریه) و دوای مرنت خێر و پاداشتەکەیت بۆ بێت،

[1] - إيقاظ أولى الهمم العالية إلى اغتنام الأيام الخالية(ص٣٥٧ )

دەی کاری چاکە زۆر بکە بۆ ڕۆژی دواییت پێش ئەوەی داماوی و پەشیمانی دەرببڕیت.

إبراهيم التيمی (ڕەحمەتی اللەی لێ بێت) دەفەرمووێت: جارێکیان وا خۆم هێنایە پێش چاوم وا لە ناو ئاگری دۆزەخدام، لە داری تاڵی زەققوم ئەخۆم، کێم و زوخاو و پیسی ناو دۆزەخ دەخۆمەوە، کۆت و زنجیر کراوم بە کۆت و زنجیری ئاسن، ئەو کاتە بە نەفسی خۆم گوت: چیت دەوێت ئەی نەفسم؟

گوتی: دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ دونیا تا کردەوەی چـــاکە بکەم، منیش پێیم گوت: ئێستا وا لەو ئاواتەدا دەژیت کە دەیبەیت، دەی کردەوەی چاکە بکە[١].

دەی ئەی بەندەی الله ئێستا ئێمە وا لە ماڵێکدا دەژین کە شوێنی کارکردن و تێکۆشان و خۆماندووکردنە بۆ تاقیکردنەوە، سبەینێ دەگوازرێینەوە بۆ ماڵێك تەنها شوێنی پاداشت یان سزایە، بۆیە هەر کەسێك لێرە کردەوەی چاکە نەکات سبەینێ لەوێ پەشیمان دەبێتەوە، هەموو ڕۆژێك کە بەسەرتا دێت غەنیمەتە بۆتۆ، کە هەوڵ و ماندوبوون و شەونخونی بکەیت بۆ دوارۆژت، بۆیە ئاگاداربەو کردەوەی چاکەی زۆر تێدا بکە و مەهێڵە کاتەکانت بە فیرۆ بڕوات، تەمبەڵ و کەمتەرخەم مەبە تیایدا، چونکە تاکە ئاواتی مردووەکان لەناو گوڕدا بریتییە لە ژیانی تەنها یەك کاتژمێر، بەڵکو کەمتر، بۆ ئەوەی ئەو کردەوە چاکانەی کە لە دەستیان چوبوو فریای بکەون و بیکەن.

---

[١] - حلية الأولياء وطبقات الأصفياء لأبی نعيم.(٤/٢١١)

﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ﴾[1] حاڵی بەدحاڵی حاشا کەرانی دینی ئیسلام لەگیانەڵڵا دا، لەم چەن ئایەتانەدا رادەگەیەنێ و، دەفەرمووێ: بێباوەڕان هەر درێژە بەکاری خراپ و بێ بڕوایی خۆیان ئەدەن تا کاتێ مردن یەخەی یەکە بەیەکەیان دەگرێت و ئەحواڵی ئاخیرەتی بۆ ئاشکرا دەبێت ئەوسا ئەڵێ: پەروەردگارم !بمگێڕەوە بۆ دونیا.

بەڵام بە هیچ شێوەیەك ڕێگەیان پێنادرێت، لەبەر ئەوەی کاتی ژیانیان بەسەر بردووە و تەواو بووە.

﴿لَعَلِّىٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ۚ كَلَّآ ۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا ۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾[2] واتە: بەڵکو ئەو کارە چاکەی کاتی خۆی لەدەستم چووە بیکەم نەخێر هەرگیز ئەو داخوازیە جێبەجێ نابێت، ئەوە هەر قسەیەو (بە ناچاری) دەیکات وەتا ڕۆژێ زیندوو دەکرێنەوە لەمپەرێکی زۆر گەورەیان لە پێشدایەو ناتوانن بگەڕێنەوە بۆ دونیا، واتە: هەرگیز ناگەڕێنەوەو هەر لەسزاشدا دەبن.

ئەی بەندەی الله کاتێك سەردانی گۆڕستانت کرد، یان جەنازەیەکت بە ڕێکرد بۆ گۆڕستان، لەو کاتەدا بێ ئاگا مەبە، قسە زۆر مەکە لەگەڵ خەڵکیدا، بەڵکو بیر لە ئاواتی ئەو مردووانەی دەورو و پشتت بکەوە، کە لەسەر گۆڕەکانیان وەستاویت، گیرۆدەی دەست کردەوەکانیانن، کاتەکانی ژیانت جوان بگرەو بە فیڕۆیان مەدە، بۆ ئەوەی زۆر یادو زیکری الله تعالی بکەیت،

---

[1] - سورەتی المومینون ئایەتی: ٩٩

[2] - سورەتی المومینون ئایەتی: ١٠٠

تاکو سبەینێ لەگەڵ مردووەکان نەبیت، ئاوات بخوازیت وەکو هەندێکیان تا بگەڕێیتەوە دونیا بەڵام پاش چی؟.! هەر کاتێك ویستت تاوان بکەیت بیر لە ئاواتی مردووەکان بکەوە، بیرت بێت کە ئێستا مردووەکان ئاواتەخوازن زیندوو بوونایە تا گوێڕایەڵی الله تعالی بکەن، دەی چۆن تۆ سەرپێچی الله تعالی دەکەیت، هەر کاتێک بینیت خەڵکانێک لەتۆ خۆشتر ئەژین و لە خۆشگوزەرانی دونیا نوقوم بوونە و پشتیان لە ئیسلام بەرنامەی الله کردووە و نەفست هانت دەدات بۆ دونیا بیر لە ئاواتی مردووەکان بکەوە!.

هەر کاتێك بینیت دەست بەتاڵیت و بێ کاریت بیر لە ئاواتی مردووەکان بکەوە!.

هەر کاتێك بینیت بێ تاقەتیت لە پەرستنی الله تعالی بیر لە ئاواتی مردووەکان بکەوە و لە خۆبایی مەبە بە خۆشی و هەڵاو بەزمی دونیا..!

پێشەوا عومەری کوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی اللەی لێ بێت) دەیفەرموو: ئەی ئەو کەسەی دەبیتە دانیشتوی گۆڕ چی تۆی لەدونیادا لەخۆبایی کرد، کوا ماڵە فراوانەکەت کوا ڕوبارە ڕێکردوەکەت، کوا بەروبومە پێگەیشتوەکەت، کوا جلوبەرگە ناسکەکانت، کوا جوانی و بۆنە خۆشەکانت وە جلوبەرگی هاوین و زستانت ؟!. قال عمر بن عبدالعزيز - رحمه الله: «فيا ساكن القبر غدا ما الذي غرك من الدنيا؟! أين دارك الفيحاء ونهرك المطرد، وأين ثمارك اليانعة وأين رقاق ثيابك، وأين طيبك وبخورك وأين كسوتك لصيفك وشتائك ؟!)[1]

[1] ـ بڕوانە: أهوال القبور وأحوال أهلها إلى النشور : ٢٤٢

کەسی بەختەوەرو سەرفراز ئەو کەسەیە کاتێك دەمرێت تاوانەکانیشی لە گەڵیدا دەمرێت تاوان و خراپەیەکی وای نییە دوای مردنی خەڵکی بیکەن و شوێنی بکەون جگە چاکە، کەسی هەژارو داماو ئەو کەسەیە کاتێك دەمرێت خراپەکانی لە گەڵیدا نامرێت دوای خۆی خراپەو تاوانی بە جێهێشتووە خەڵکی دەیکەن و لەسەری دەڕۆن.

دەی ئەی بەندەی الله ڕستەی (ئاواتی مردووەکان) بەردەوام با لەسەر زمانت بێت، بەردەوام با لە خەیاڵت بێت، چونکە باشترین هاندەرە بۆ ئەوەی کردەوەی چاکە لە ژیانت دا زۆر بکەیت، خۆت ماندوو بکەی لە تاقیکردنەوەی ژیانی دونیا، تاکو پەشیمان و سەرشۆڕ نەبیت.

ئەی براکەم خوشکی من لە الله بترسە، ئەو کات و تەمەنەی ماوتە لە عیبادەت و پەرستنی الله سەرفی بکە، وەکو قوتابیە بێخەم و تەمبەڵەکان مەبە باش بزانە هەر مردوویەك کاتێك کەمتەرخەم بووە لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی الله، ئێستا پەنجەی پەشیمانی دەگەزێت، ئاواتەخوازە ژیانی دونیای بۆ بگەڕێتەوە تا گوێڕایەڵی الله بکات، تا حەق و مافی مرۆڤەکان بگێڕێتەوە، گوتنی تەنها یەك (سبحان الله) بەلایانەوە باشترە لە هەموو دونیاو ئەوەی کە تیایدایە، بە دڵنیاییەوە هەستیان کردووە و دەزانن هیچ شتێك سوودیان پێ ناگەیەنێت تەنها عیبادەی الله نەبێت.

ئەو کەسەی کاتی بە فیڕۆ ئەدات بە گاڵتەو گەپ و بە دیار کەناڵ و فیلمە بێ سوودو زیان بەخشەکان و شوێنە گشتییەکان، و شوێنکەوتنی کوێرانەی شێخ و فلان گروپی گومڕا و بێدین، ئەگەر دەزانێت مردووەکان ئاواتی چی دەخوازن، ئەوە هەرگیزو بە هیچ شێوەیەك تەنها یەك خولەك لە کاتی خۆت بە فیڕۆ نادەی و قیامەتی خۆت بۆ دونیای کەس نادۆڕێنێت.

ئەی بەندەی الله ئەگەر دەزانی تەمەنت چەندی ماوە ئاواتت زۆر نابێت لە دونیا، کردەوەی چاکە زۆر دەکەیت، ئاگادار بە پێت هەڵنەخلیسکێ و لە ڕێگەی ڕاستی ئیسلام و تەوحید لانەدەیت، لە پەشیمان بوونەی دوای مردنت کەم بکەوەو خۆتی لێ بپارێزەو لێی بترسە، ژیانت، بوونت، لەش ساغیت بە غەنیمەت بگرە پێش نەمان و مردنت.

بەڵێ ژیان تەنها چەند هەلێکەو لە دەست دەچێت و جارێکی تر ناگەڕێتەوە، کاتێك دەزانیت و خۆت دەبینیتەوە وا لە ڕیزی مردووەکاندایت، هەوڵ بدە چاکە زۆر بکەیت پێش ئەوەی بمریت، سەر ڕاستانە بۆ الله خۆت یەکلا بکەوە بە تەنها بەندەی ئەو بی و دووربی لە ڕێگا و ڕێبازی گومڕای و دەست پێشخەری بکە لە تەوبە کردن هەتا لە دونیادای و کاتت هەیە، پێش هاتنی کاتێك کە ناتوانی تەوبە بکەیت و بگەڕێیتەوە بۆ لای الله، پێش ئەوەی مردن لە ناکاو و کتوپڕ یەخەت پێبگرێت و ڕێگر بێت لە کردنی کردەوەی چاکە، ئەو کاتە ئاواتەخوازیت و دەڵێیت:

**﴿يَقُولُ يَا لَيْتَنِي قَدَّمْتُ لِحَيَاتِي﴾**[1] واتە: خۆزگە کاری چاکەم پێش بخستایە بۆ ژیانەکەم.

ژیانی نەبڕاوە و ڕاستەقینە تەنها لە بەهەشتدایە، بۆیە ئەو کەسە ئاوات ئەخوازێت کردەوەی چاکەی زۆرتر بوایە کاتەکانی ژیانی دونیای بە فیڕۆ نەدایە تا ژیانی دوای مردنی خۆشتر بوایە.

سبحان الله نازانم دڵمان بەچی خۆشبکەین لەم دونیایەدا، پارە، باوک و دایک، ژن و منداڵ، نازانم بەچی و چی، گشتی لەناو دەچن، هەموومان بێئاگاو دڵ ڕەقین، دڵمان بۆتە بەرد، بەردتر و ڕەقتر لە هەموو ڕەقیەک، ئەگەر بەس ڕاستی و حەقیقەتی دونیاو مردن و قەبر و قیامەتمان زانیبا ئەبوایە تەواوی ژیانمان بەس گریان بوایە، لە بری فرمسێک خوێن و ئازار لەچاوەکانمان دڵۆپ دڵۆپ هاتبایە خوار بەسەر گۆناکانمان، بەڵام والله دونیا دڵ و دەمار و مێشکی داگیرکردووینە، تۆزێک بیر لە ئایەتەکان و ناخۆشی و سەختیەکانی مردن و دواڕۆژ بکەنەوە، سەیری پیشینانمان بکەن چۆن ترسی قیامەت و مردن خۆشی دونیایان لێ تاڵکردبوو و پەردەی دڵیان داڕمابوو.

ئەبو ئوسامە دەڵێت: سوفیانی ثەوری (ڕەحمەتی اللەی لێ بێت) نەخۆشکەوت، دەرهاویشتەکەیم (میز) برد بۆلای دکتۆر، گوتی: ئەمە دەرهاویشتەی پیاوێکە کە خەم و ترس جگەری خاش خاش کردووە، دەرمانی نییە.

---

[1] - سورەتی الفجر ئایەتی: ٢٤

(عن أبي أسامة قال: مرض سفيان الثوري، رحمه‌الله فذهبتُ بمائه إلى الطبيب، فقال: هذا بول رجل قد فتَّتَ الحزن كبده، ما له دواء).[1]

بەڕاستی زۆر دڵ ڕەق و بێ ویژدانین، دڵمان خاڵیە و وەکو داری کلۆر وایە لە ترس و مردن و گەڕانەوەمان بۆ لای الله.

بیر لەم ئایەتە بکەنەوە بە گوێی دڵ و هەموو هەست و نەستەکانت، (وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَٰدَىٰ كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَٰكُمْ وَرَآءَ ظُهُورِكُمْ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَٰٓؤُا لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ)[2]، واتە: لە ڕۆژی دواییدا الله تعالی بە بێ باوەڕەکان ئەفەرموێ: وا ئەمڕۆ بێ ماڵ و حاڵ و ڕووت و قووت و تاك و تەنیا بێ سۆ هاتنەوە لامان، هەروەك چۆن لەسەرەتاوە بێ ماڵ و حاڵ وڕووت وقووت دروستمان کردن، وهەرچیشمان پێدابوون لەماڵ وسامانی دنیا، لەدوای خۆتان گشتتان جێهێشت ئەوانەیش نابینین بەهاناتانەوە بێن کەپێتان وابوو شەریك و هاوبەشی خوان، هەتا تکاو شەفاعەتتان بکەن ئەوا هەرچی ئەسباب وهۆی پەیوەندی نێوانتان بوو بچڕاو نەما ئەو شتانەش ئێوە بە خەیاڵ واتان دەزانی تکاتان بۆ ئەکەن، هەموو تیاچوون و بەهیچ دەرچوون.

---

[1] - سير الأعلام (٧/٢٧٠)

[2] - الانعام٩٤

پرسیار کرا لە عەطائی سولەیمی (ڕەحمەتی اللەی لێ بێت): ئارەزووی چی ئەکەیت؟!

ئەویش فەرمووی: ئارەزوو ئەکەم ئەوەندە بگریم تا توانای گریانم نامێنێت.

بەڕاستی لە حەقیقەتی دونیا حاڵی ببوون ئارەزووی هیچی نەکردووە جگە لەوەی تێر بگریت و تا توانای گریانی نەمێنێ.

بیرت کردەوە کە هیچ شتێک سوودی نیە بۆت لە قیامەت شەرم نیە توخوا دڵت وابەستەی خۆشی دونیا و ڕابواردن بکەیت، تۆزێک بەزەیت بەخۆت بێتەوە، تۆزێ بگری بۆ لاشەکەت بەیانی دەبێتە خۆراکی کرم و حەشەراتی ژێر گۆڕ، دڵت بەچ خۆشدەکەی جوانیەکەت و نازو مەکرەکانت بەچی دڵنیابە هەرچی بێ لە کۆتایی دەبێ جێی بێلێت ئەم ژیانە، بۆیە بەتەنها و بەس و بەس بەندەی الله بن بێ منەت لە هەمووشت جگە الله و بۆ الله ژیان و بەس دڵ و ژیانتان تەسلیمی ئەو بکەن.

بۆیە خۆشبەحالی ئەوەی بۆ کۆششکردنی لە پێناو قیامەت و بەهەشتی پڕ لەنازو نیعمەت تێدەکۆشێ، شەونخونی دەکات، ئازار دەچێژێ، هیلاک دەبێ گشتی لە پێناو ڕەزامەندی الله دەبێ تا سەرفرازی مسۆگەر بکات، بە ئیزنی الله تعالی.

بۆیە مەهێڵە هیچ خولەکێکی ژیانت بەفیڕۆ بڕوات، بەڵکو لە پەرستنی الله بەسەری ببە، پێش ئەوەی داماوی و پەشیمانی دات بگرێت لە ڕۆژێکدا کە پەشیمانی و ئاوات خواستن هیچ سوودت پێناگەیەنێت.

# لە کۆتایی

داواکارم لە الله تعالی بیکاتە مایەیی خێر و سوود بۆ موسڵمانان و گەڕانەوەمان بۆ ئیسلام، و تێکۆشانمان لەم ڕێگا پیرۆزە بۆ گەیشتن بە بەهەشت و ڕەزامەندی الله تعالی، لە کۆتایی ئەی براو خوشکانم هەموو ڕاستی و حەقیقەتێکت بۆ دەرکەوت، سەبارەت بەم ژیانەی ئێستا کە تێیداینە و هێشتا ئەجەل و کاتی دەرچوونمان نەهاتووە، بۆیە با خۆمان ماندو بکەین و تێکۆشان بکەینە خەمی سەرەکی و گشت خەمەکانی دونیا پشت گوێی بخەین، لە پێناو ئەو بەهەشتەی کە خۆشیەکانی هەمیشەین، ئەگەر لە خۆشترین کات و ساتی ژیان بن، بە هەواڵ و شتێکی بچووک نەخۆشیەک، سەر ئێشە و ژانێک تەواوی خۆشیەکانت دەگۆڕێ بۆ دڵتەنگی و ئازار و غەم و ناخۆشی، کەوایە ژیانێکی ئاوا کەم و کاتی شایەنی ئەوە نیە بەهەشتێکی هەمیشەیی و پڕ لە خۆشی و ناز و نیعمەت و دوور لە دڵتەنگی و نەخۆشی و ئازار و ژان لەدەست بدەین؟!

بۆیە با بەڵێن بدەین بە الله تعالی کە بۆ جگە ئەو نەبێ نەژین و نەمرین، و هیچ خۆشی و ڕابواردنێکی دونیایی هەڵمان نەخەڵەتێنێ لە ڕێگای حەق و بۆ ڕێگای شەیتان و گومڕایی دواتر پەشیمانی سوودی نیە کە مردین، بۆیە با مەردی الله بین لەم تاقیکردنەوەی ژیانی دونیا سەرکەوتن بەدەست بێنین..

براتان: عبدالله خاکی

**خوێنەری بەڕێز: داوام وایە دوای خوێندنەوەی ئەم کتێبە بیدەی بە هاوڕێ و ناسیارەکانت تاکو ئەوانیش سوود ببین بۆت ببێتە خێری نەبڕاوە.**

**{ وَمَا تَوْفِيقِي إِلَّا بِاللَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ }**

## ناوەرۆک